# خۆری ئیسلام

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری زانستی ئیسلامی وەرزی یە
وەزارەتی ئەوقاف وکاروباری ئیسلامی دەری دەکات

2

سالی یەکەم



جەمادی الاخرە ـ ڕەجەب/ ١٤١٩ک، گەلاڕێزانی / ٢٦٩٨ی کوردی، تشرینی یەکەمی/ ١٩٩٨ زاینی



# خۆری ئیسلام

**سالی یەکەم**

جمادی الاخرە - رەجەب - ١٤١٩ك
گەلاریزانی ٢٦٩٨ی کوردی بەرامبەر
تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ز




**2**

**گۆڤارێکی رۆشنبیری زانستی ئیسلامی وەرزیە**
**وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی دەری دەکات**


**خاوەنی ئیمتیاز**
**مەحمود کاوە حەفیدزادە**

**سەرنووسەر**
**مەلا ئەحمەدی خانەقا**

**جێگری سەرنووسەر**
**حاکم جەمال جەلال**

**سکرتێری نووسین**
**حەمە ئەحمەد جاف**

**سەرپەرشتکار**
**عەدنان حاجی کاکە**

**ناونیشان**
هەولێر - دیوانی وەزارەتی ئەوقاف و
کاروباری ئیسلامی
(نووسینگەی راگەیاندن)





سەرنووسەر : (٤٠٨٣)
(٢٠٤٨٦)
جیگری سەرنووسەر : (٤١٣٩)
(٢٢٦٩٢)
سکرتیری نووسین : (٤٦٧٧)
سەرپەرشتکار (٢٢٧٥١)



پیتچنین و دەرهێنانی هونەری :
کۆمپیوتەری (ئەپڵس)


## لەم ژمارەیەدا



# بەرەو خۆر ٧

هانا

هەرچەندە ژمارەیەكی زۆر لەڕۆشنبیران و زانایان لەم سەردەمەدا هەردەم لەململانێ و دەمەقاڵێی بەردەوام دان.
سەبارەت بەپەرەسەندن و پێشكەوتنی زانست و فراوان بوونی ئاسۆی زانیاری و داهێنان لەژیانی مرۆڤایەتی‌دا، بەڵام هەمیشە لەیەك خاڵدا یەك دەگرنەوە ئەویش ئەوەیە كەمرۆڤ خۆی خاوەن داهێنانە بەرێگەی ئەو ژیرییەی كەخوای پەروەردگار پێی بەخشیوە، ئەو مرۆڤە لێرەو لەوێ و لەم بوارو لەو بوار داهێنانەكەی بۆ خزمەت كردنی رەوتی مرۆڤایەتی بەكاردێنێت. ئەگەر لەگەڵ دروست بوونی ئادەمیزادەوە دەست پێ بكەین و ئەو هەموو چەرخ و سەدانە لەچەرخی بەردینەوە تا كۆتایی سەدەی بیست بەهەند هەڵبگرین و هەنگاوەكانی پێشكەوتنی زانست و رۆشنبیری و تەكنەلۆژیا لەم بوارەدا روون بكەینەوە، دەتوانین بڵێین كەئاینی پیرۆزی ئیسلام و ئەو قورئانە موعجیزەیەی بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی هاتۆتە خوارێ تاكو رەوتی ژیان و دەیمومیەتی كاروبارەكانیان رێك بخات، پێگەیەنەری عەقلیەتی مرۆڤ بوونە، چونكە داهێنان لەزانست‌دا، راستەوخۆ بەعەقڵی مرۆڤەوە بەندە، كاتێك لەقورئانی پیرۆزدا، خوای مەزن فەرمانمان پێ دەكات و دەفەرموێت: سەیری ئەو زەوی و ئاسمانە بكەن چۆن دروست كراون، لێرەدا هانمان دەدات، هەم بۆ گەورەیی خوا لابكەینەوەو هەمیش گەڕان بەدوای زانست و شرۆڤە كردن و لێكۆڵینەوە لەم بوونەوەرانە، مەبەستیش تیشك خستنە سەر ئەو راستیەیە كەیەزدان ئاماژەی بۆ دەكات (وما أوتيتم من العلم الا قليلاً)الاسراء/٨٥، وداواشمان لێ دەكات زیاتر روو لەزانست بكەین (وقل رب زدني علماً طه/١١٤)، ئەگەر ئەو خوایە مەزنە مەبەستی كۆتایی بایە بۆ زانست و لێكۆڵینەوە لەدیاردەكانی سروشت و دەوروبەر، نەیدەفەرموو زیاتر بەدوای زانست‌دا وێڵ بن و هەوڵ بدەن زیاتر لێكۆڵینەوەو داهێنان و بەرەو پێش چوون ئەنجام بدەن.
لێرەدا بۆمان دەردەكەوێت. كەهەرچی شارستانی پێشكەوتووی گەلان هەیە، بنەما سەرەكی و رۆشنبیرییەكانی لەقورئانی پیرۆزو فەرموودە بەنرخەكانی پێغەمبەری مەزن (ﷺ) هەڵێنجراوەو تارادەیەكی زۆر، لەهەندێ لایەن‌دا پشتیان پێ بەستووە، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەندی بەسیما رەوشتی و بەهاكانی كۆمەڵەوە هەیە، ئەگەر لاپەرە پرشنگدارەكانی مێژووش هەڵدەینەوە، دەبینین، مرۆڤ هێندە پەرۆشی زانستی بووە، كەتەنانەت زۆربەی كاتەكانی ژیانی بۆ تەرخان كردووە. نموونەشمان بۆ ئەمە زۆرە لەوانە (البخاري ومسلم والطبري ومالك



والشـافعي والغـزالي)و زۆری دیکـەش، کەهەمیشـە پـەیڕەوی ئیسـلامییان کـردووە بەبەرنامەیەك بـۆ گـەڕان بـەدوای زانستو داهێنانو بەجێ هێنانی فـەرمانو نمایشـەکانی خـودای مـەزنو پێغەمبـەری رابـەرمان (ﷺ)، لـەم بوارەشـدا سـاڵانێکی زۆر رەنجیـان داوەو کۆششـیان کـردووە، تـا گەیشـتوونەتە چەندین راستیو بەم کارانەشیان خزمـەتێکی زۆری نەتـەوەکانیان کـردووەو رابـردووی دێرینیـان بـەئایندەی پرشـنگداریان بەستونەتەوە.

کـاتێکیش پـەروەردگار پلـەو مـەقامی زانایـانی بـەرز کـردەوە فـەرمووی (انما يخشى الله من عبـادة العلمـاء)فـاطر/٢٨، جیاوازییـەکی بـەرچاوی خسـتە نێوان خوێندەوارو نـەزان کـاتێك فەرمووی (قل هل يستوي الذين يعلمـون والذيـن لايعلمـون) پێغەمبـەری مەزنیشـمان هـەر لـەبواری زانسـتو خـۆ مـاندوو کردن بۆ بەدەست هێنانی زانست دەفەرموێت:(طلب العلم فريضة علـى كـل مسـلم ومسـلمة)(رواه مسلم)، ئەمانە هەموویان گەواهی ئـەوە دەدەن کـەتا چ رادەو سنوورێك ئاینی پیرۆزی ئیسلام پشتگیری زانستو فراوان بوونـی ئاسـۆی زانیـاری گـەلان دەکـات، هـەر لـەم بوارەشـدا ئـەم ئاینـە پیرۆزە داوای کردووە کەبەفتواو رێنمای زانایان سەرجەم گرفتو کێشـەکانی کۆمـەڵو دیـاردە دزێوەکـان چارەسـەر بکرێـتو بـەپێی رێنمـاییو رەفتـارە بەجێکانیان، دەردەکـانی کۆمـەڵ دەست نیشان بکەین، ئەمەشیان بەگشـتی لقـەکانی زانسـت لەتەکنـەلۆژیاو دەروونزانـیو کۆمەڵناسیو ئابووریو تا دوایی ئـەنجام دەدرێـت، کەهـەموویان لەخزمـەتی مرۆڤایـەتی دانو ژیـانی نەتـەوە هـەرگیز لێیـان دانابڕێت.

زانـای ئـایین، ئـەو کەسـەیە کەپـەیوەندی راسـتەوخۆو شـارەزاییەکی چـاکی بەزانسـتەکانی دەوروبەرییـەوە هەیە، دیارە لەهەندێك سەردەمی مێژوو بۆ نموونە بێزەنتییـەکان، زانسـتو ئاینیـان لەیـەکتر دادەبـڕی، بۆیـە کاریگـەرییان بەسـەریەکەوە کـەم بـووە، بـەڵام لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە، بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو داهێنـانی ئـەتۆمو دواجـاریش کۆمپیوتـەرو ئەنتـەرنێت دەبینین، ئـاینی پـیرۆزی ئیسـلام زیـاتر بـەهێز دەبێـتو ئـەو زاتانـەی کەمامەڵە لەگـەڵ ئـەم بوارانـەدا دەکـەن بەشـێکن لەوانـەی کەهـەردەم خۆشـگوزەرانی گەلەکـەیان دەوێـتو لەخـەمی پاراستنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دان چونکـە گەیشـتونەتە ئـەو بڕواو قەناعەتـەی کەبـەم ئایینـە پـیرۆزە هـۆشو هزریـان زاخـاو دەدەنو داهێنانـەکانیان ئـەنجام دەدەن. لێرەدا ئەوەمان بـۆ روون دەبێتـەوە کەهـەر هـەنگاوێکی داهێنـان ئەگـەر پشـتی بەبنـەما پیرۆزەکانی ئاین بەست ئەوا بێ گومـان کۆڵەگـەی سـەرکەوتنی بـەهێزتر دەبێـت، بەپێچەوانـەی هـەندێك کۆمـەڵگای رۆژئـاوا، کەبۆشاییەکیان لەنێوان زانستو ئـایین هێناوەتـە کایـەوە، بۆیـە مـرۆڤ لـەم سـەردەمەدا، گـەر بەعەقڵ رەفتار بکاتو بیر بکاتەوە چاك لەلایەنـە شاراوەکانی ئـەم گەردوونـە دەگـاتو دەرك بـەوە دەکـات کـە لـەدوای ئـەم هـەموو نهێنـیو بوونەوەرانـەدا خـاڵقێك هەیە، کەنەك وروژێنـەری توانـاو هزرو عەقڵی مرۆڤایەتییەو بـەس، بەڵکو هـەموو جوڵانەوەو چرپـەو بـەرێوەچوونی سـەرجەم سستەمەکان لەدەسـتی ئـەو دانو شارستانێتی ئـەم چەرخـەش تـا دونیـاش مابـێ، لەبنـەماو هـزری پـیرۆزی ئـەم ئاینـە سـەرچاوە دەگرێـت، کـەتا مرۆڤایـەتی بەردەوام بـێ هەمیشـە رێکخـەرو رۆشـنکەرەوەی رۆحـیو فیکـری رێبازەکەیەتی.



# ئیسلام ئایینی ئاشتیو بەیەکەوە ژیانە

ئەحمەد مەلازادە

پەیوەندی بنەرەتی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا، پەیوەندییەکی چەسپاوەو بەگوێرەی پەرەپێدانی مرۆڤایەتی، لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگۆڕێت، ئەگەر ئەم کۆمەڵگەیە هاوکاریو بەیەکەوە ژیان لەنێوانیاندا بەپێودانگەی ئاشتیو لەیەک حاڵی بوون نەچەسپێت رەنگە چارەنووسێکی نادیارو خەتەرناک چاوەڕوانیان بکات.. ئەگەر بە درێژایی مێژوو لەشارستانیەت و مێژووی پێشکەوتنی کۆمەڵگاکاندا نزیک بینەوەو لاپەرەکانی خەبات و کۆششیان لەپێناوی ئاسوودەییو بەختەوەریو ئاشتیدا هەڵدەینەوە، دەگەینە ئەو بڕوایەی کە هەرچەندە ئەو کۆمەڵگایە بەردەوام بن پێویستیان بە سیستەمێکی زیندوو هەیە، ئەویش پەیڕەو پرۆگرامی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە. کێ لە ئێمە رۆژانە گوێبیستی دەیان گرفت و کێشەو ململانێی خوێناوی نابێت کە لەوڵاتانی دونیا روودەدات، کە بەسەدان مرۆڤ دەبنە قوربانیو بەهەزاران خانووبەرەو زەویو زار دەسوتێو وێران دەبێت.

ئاشتی، ئەو ووشەیەیە کەخواست و ئاواتی هەموو گەلانەو سەرچاوەی سەقامگیربوونی ئاسایشو ژیانی بەختەوەرە بۆ کۆمەڵ، ئیسلامیش کە لەسەر هێمنی و ئاسایش بناغەی داکوتاوە، ئاشتی کردووە بە هاوگیانی خۆی. هەموو دروشمەکانی ئیسلام لەسەر (ئاشتی- سلام) دامەزراوە، خوای مەزن دەفەرموێت: (یا ایها الذین آمنوا ادخلوا في السلم كافة ولا تتبعوا خطوات الشيطان إنه لكم عدو مبين) (البقرە:٢٠٨)، لێرەدا خوای پەروەردگار فەرمان دەکات بێینە ژێر باڵی ئاشتییەوە، چونکە ئاسوودەگی گەلان و بەردەوام بوونی رەوتی ژیانیان لەسەر ئەم خاڵە بەندە.. مرۆڤ ئەگەر سەیری دەوروبەری خۆی بکات و لەزەویو ئاسمان و شاخ و ئەستێرەو دەریاو رەشەباو باران و سەرماو گەرما وورد ببێتەوە، دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە مادامەکی خالقێك هەیە کە ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤایەتیو میللەتانی ئیسلامیش بەتایبەتی کە هەرچی خوا پێی خۆشەو لەسوودو بەرژەوەندی ئێمەدایە، هەمیشە پەیڕەوی بکەین و سەرپێچی لێنەکەین.

ئیسلام بەشێوەیەك دەڕوانێتە ئاشتی کە هەموو کات دەیپارێزێ و بواری نەداوە جەنگ و هەراو



کێشەی چەکداری هەڵگیرسێنێ‌و تا پێی کراوە بەرگری لەئاشتی کردووەو بۆ ئاسودەیی گەلان لەهەوڵ‌و تەقەلادا بووە، تەنیا ئەوە نەبێت کە بۆ چەسپاندنی بنەما پیرۆزەکانی خۆی، ئایینی ئیسلام داوای جیهادی کردووەو لەم بوارەشدا بەهەزاران شەهید لەپێناو بەرزکردنەوەی ئالا پیرۆزەکەی‌دا چوونەتە بارەگای خودا. داواش دەکات جەنگ لەگەڵ ئەو کۆمەڵانەدا بکرێت کە دژی پەیرەوو پرۆگرامی ئیسلامەو بۆ وێرانکاری‌و بلاوبوونەوەی گەندەڵی (فساد)و خراپەکاری کاردەکەن بۆیە دەفەرموێت: (واعدوا لهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدو اللـه وعدوكم) (الانفال/٦٠) آية(٦٠).

بەداخەوە ئەوەی ئەمڕۆ ئەو خەڵکەی تووشی هەڵە کردووە، ئەوەیە کە بەو چاوە سەیری ئیسلام ناکەن، کە هەموو لایەنەکانی ژیان بگرێتەوە، هەموو پارچەو لق و پایەکانی لەبەرچاو ناگرن، بۆیە پێویستە ئەوانە بزانن کە یاسای ئیسلام هەموو دەستوورو پلانەکانی خۆی دەست نیشان کردووە، ئاشکراشە کە ئاشتی سەقامگیر نابێت لەگەڵ‌و جیهاندا، تا تاکی ئەو کۆمەڵە بەهرەمەندە نەبێت بەئاشتی.

چونکە باوەڕ لەنێو دڵی تاکدا دەبێتە بناغە بۆ چاندنی لەنێو کۆمەڵ‌و پاشان ژیانی مرۆڤایەتی پێ بەختەوەر دەبێت و لەسایەی‌دا دەحەسێتەوە.

هەر ئیسلامە بیرو فکری ئادەمیزاد رزگار دەکات لەهەموو ئەندێشەیەك، بەئاشکراش بناغەی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کۆمەڵ دارشتووە، هەرگیز شەڕی نەکردووەو بەرامبەر کاری خراپەو تەڵەکەبازی‌و روخێنەری بەها پیرۆزەکانی کۆمەڵ نەسڵەمیتەوەو چۆکی دانەداوەو بەئاشکرا سەبارەت ئەو کەسانەی گاڵتە بەم ئایینە دەکەن و بەچاوێکی نزمەوە دەڕواننە بەها رەسەنەکانی، لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: (وعباد الرحمن الذين يمشون على الأرض هونا واذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاما)(الفرقان:٦٣).

خۆشی‌و بەختەوەری خەڵك لەدەست خودای تاك و بێ هاوتایە، ئەگەر هەموو هێزی سەر زەوی شان بەیەکتری بدەن بۆ ئەوەی تووشی ئەهامەتییەکتان بکەن، ناتوانن ئەگەر ویستی خوای لەسەر نەبێت، جاری واش هەیە خودای گەورە کارەساتێك بەسەر کۆمەڵ دێنێ، بەلام بۆ دوارۆژ خێرو خۆشی لێدەکەوێتەوە، (..... وعسى ان تكرهوا شيئاً وهو خير لكم وعسى ان تحبوا شيئاً وهو شر لكم والله يعلم، وانتم لاتعلمون)(البقرة:٢١٦).

کەواتە خۆشی‌و ناخۆشی خەڵك هەمووی بەدەست ئەو خوایەیە، تەنیا رەزامەندی ئەو بەسە بۆ پێشکەوتن و ئاسوودەیی گەل و کۆمەڵ، خوای گەورەش وا سەیری ئێمە دەکات کە لەهەموو بوونەوەرێك زیاتر رێزی گیراوە (ولقد كرمنا بني آدم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلاً) (الأسراء:٧٠).

بەڵێ، هەر ئایینی پیرۆزی ئیسلامە سەرچاوەی بەختەوەری‌و ئاسوودەیی و ئاشتی‌یە، دەبێت کۆمەڵیش بەوپەڕی دڵسۆزی‌و بڕوا قایمییەوە هەردەم لەفەرمانەکانی خوا دەرنەچێت‌و پەیرەوی ئیسلامیش لەژیانی رۆژانەیدا ببێتە پرۆگرامی کارکردن و خواپەرستی‌و بەیەکەوە ژیان، تا رەزامەندی خواو پێغەمبەری مەزن(د.خ) هەردەم باڵی بەسەر ئەو کۆمەڵەدا بکێشێ.





# هەواڵو چالاکییەکانی وەزارەت

ئا / خۆری ئیسلام

* رۆژی یەکشەمە ١٢/٧/١٩٩٨ بەڕێز مەحمود کاوە حەفید وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی بەڕێزان بەڕێوەبەری گشتی دیوان و بەڕێوەبەری ئەوقافی هەولێر کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی کۆمەڵگاکانی دەوروبەری هەولێر سازدا. تیایدا باس لەپێشوازی کردنی مانگی پیرۆزی مەولودی پێغەمبەر (ﷺ)کرا.

* رۆژی ٢/٨/١٩٩٨ بەڕێز وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پێشوازی لەبەڕێز د. عەلی قەرەداغی سەرۆکی رابیتەی ئیسلامی کوردو شاندێکی یاوەری کردو تیایدا هەماهەنگی وەزارەت بۆ کارە خزمەتگوزارییەکانی رابیتە لەبواری خزمەت کردنی دەزگاو پرۆژە ئیسلامییەکان دووپات کرایەوە.

رۆژی ٤/٨/١٩٩٨ بەڕێز مەحمود کاوە حەفید وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی بەڕێز مەلا ئەحمەدی خانەقا بریکاری



وەزارەت و ژمارەیەك لەمامۆستاو زانایانی ئایینی هەولێر پێشانگایەکی قورئانی پیرۆزو تەفسیرو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)ی کردەوە.

هەر هەمان رۆژ بەڕێزی خەڵاتی وەزارەتی بەسەر قوتابیە یەکەمەکانی خوێندنی ئیسلامی دابەش کرد.

* رۆژی ٨/٨/١٩٩٨ بەڕێز مەحمود کاوە حەفید وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی لەهۆڵی وەزارەت خولی رۆشنبیری بۆ قوتابیانی قوتابخانە ئایینیەکان و پەیمانگای پێش نوێژی و وتار خوێنەکان کردەوە.

هەر هەمان رۆژ سەردانی مزگەوتی حاجی مستەفای لەشاری هەولێر کرد.

* رۆژی ٩/٨/١٩٩٨ بەڕێز وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پێشوازی لەبەڕێز (ئەلکساندەر روسێل) رێکخەری رێکخراوی (MEDS) کردو تیشك خرایە سەر رۆڵی رێکخراوی ناوبراو لەخزمەت کردنی هاووڵاتیان.

* رۆژی ١٢/٨ بەڕێز وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پێشوازی لەبەڕێز (پەتریارك مارو رۆفائیل) پاتریارکی یەکەمی کلدانی جیهانی و (د. مارجاك اسحاق) مەترانی ئەبرەشیەی ناوچەی هەولێرو (خوری روفائیل) وەفدێکی یادەوەریان کرد. لەدیدارێکدا باس لەبرایەتی





نێوان موسڵمانانی هەرێمی کوردستان و برا مەسیحیەکان کرا.

* رۆژی ١٧ی ئابی ١٩٩٨ لەچوارچێوەی ئاهەنگەکانی ١٦ی ئابدا بەڕێز مەحمود کاوە حەفید وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی ژمارەیەك لەبەرپرسانی حزبی و ئیداری پێشانگای دووەمی پۆستەری سیاسی بۆ هونەرمەند (رازاوە کەریم) لەهۆڵی پەروەردەی سلێمانی کردەوە.

* رۆژی ١٩٩٨/٨/٢٢ بەچاودێری بەڕێز وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی و بەئامادەبوونی بەڕێز مەلا ئەحمەدی خانەقا پێشانگایەکی خۆشنووسی لەلایەن کۆمەڵەی خۆشنووسانی کوردستان بەهاوکاری وەزارەت لەهۆڵی بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر کرایەوە.

* رۆژی ١٩٩٨/٨/٢٥ بەسەرپەرشتی بەڕێز وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی بەڕێز بریکاری وەزارەت و بەرپرسانی ئەوقاف و نوێنەرانی وەزارەتەکانی (داد و



دارایی و کشتوکاڵ و شارەوانی) ئەنجومەنی باڵای زانستی وەزارەت، کۆبوونەوەیەکی ئاسایی سازکرد.

* رۆژی ١٩٩٨/٩/١ بەڕێز مەحمود کاوە حەفید وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی مزگەوتی گەورەی لەقەزای



شەقڵاوە بەسەرکردەوە کەلەلایەن وەزارەتەوە نۆژەن دەکرێتەوەو (٤٤٢) هەزاری دیناری بۆ تەرخان کراوە.

* رۆژی ١٩٩٨/٩/٢ بەڕێز وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی سەردانی کۆمەڵگەی دارەتووی کردو هەردوو مزگەوتی گەورەو مزگەوتی (عمر کوڕی عبدالعزیز)ی بەسەر کردەوە، بەڕێزی لەپێویستی و کەموکوڕییەکانی کۆڵیەوە.

هەمان رۆژ بەڕێزی لەدیوانی وەزارەتدا پێشوازی لەبەڕێز کەمال حەسەن چاومار بەرپرسی لقی چواری پارتی دیموکراتی کوردستان کرد.

* رۆژی ١٩٩٨/٩/٧ بەئامادەبوونی بەڕێز شەوکەت شێخ یەزدین وەزیری دارایی و ئابووری، لیژنەی ئامادەکردنی بودجەی ساڵی (١٩٩٩) دەستی کرد بەگفتوگۆ کردن لەسەر بودجەی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی. دوای تاوتوێ کردن بەتێرو تەسەلی ئینجا بریار لەسەر خەملاندنی بودجەکە درا.

* رۆژی ١٩٩٨/٩/١٢ بەسەرپەرشتی بەڕێز مەحمود کاوە حەفید وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی بەڕێزان بریکاری وەزارەت و بەڕێوەبەری گشتی دیوان و ژمارەیەك لەبەرپرسان ئاهەنگی دەرچووانی (٧٠) قوتابی لەخولی بەهێز کردن و لەبەرکردنی قورئانی





پیرۆز سازکراو خەڵات بەسەر دەرچووان دابەش کرا.

* رۆژی ۱۱/۹/۱۹۹۸ بەڕێز وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەیاوەری بەڕێز بریکاری وەزارەت سەردانی کۆمەڵگەی (پیرزین)یان کردو هەر سێ مزگەوتی (گەورەو بۆلیان و مەران)ی کۆمەڵگەکەیان بەسەر کردەوەو مزگەوتەکانیان کۆلیەوە.

* رۆژی ۲۵/۷/۱۹۹۸ بەڕێز مەلا ئەحمەدی خانەقا بریکاری وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی بەڕێزان حاکم جەمال جەلال بەڕێوەبەری گشتی دیوان و ژمارەیەك لەبەڕێوەبەرانی وەزارەت دەروازەی (۲۷) دوکانیان لەپایتەختی هەرێم کردەوە، کەبەشێوەی (مساطحة) لەلایەن وەزارەتەوە دروست کراوە.

* رۆژی ۳۰/۸/۱۹۹۸ بەڕێز مەلا ئەحمەدی خانەقا بریکاری وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی یەکەم خولی فێربوونی (تەجویدی قورئانی پیرۆز)ی لەمزگەوتی شەهید سەباح لەشاری هەولێر کردەوە.

* رۆژی ۱۵/۸ بەڕێز مامۆستا مەلا ئەحمەدی خانەقاه بریکاری وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەیاوەری ژمارەیەك لەبەرپرسانی وەزارەتی هۆڵی ئەزموونەکانی ئەنجومەنی زانستی بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی لەلایەن لەدواناوەندی جەماوەری بەسەر کردەوە.

* رۆژی ۳/۱۰/۱۹۹۸ بەڕێز (مەحمود کاوە حەفید زادە) وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەیاوەری بەڕێزان حاکم جەمال بەڕێوەبەری گشتی دیوان و



بەڕێوەبەری ئەوقافی هەولێرو بەڕێوەبەری ئەندازەو ئاوەدانکردنەوەو بەڕێوەبەری قوتابخانەکانی ئایینی سەردانی مزگەوتی (سەید غەریب)و (تەکیەی مەلا عیرفان) کرد کەلەلایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەجوانترین شێوەی هاوچەرخ و شارستانی ئیسلامی نۆژەن کراوەتەوەو کەلوپەل و کەرەستەو پێداویستیەکانیان بۆ دابین کراوە.

* رۆژی ۷/۱۰/۱۹۹۸ بەڕێز مەحمود کاوە حەفید زادە وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی بەڕێز مەلا ئەحمەدی خانەقا بریکاری وەزارەت لەنووسینگەی خۆی پێشوازی لەبەڕێز مامۆستا مەلا مەحمود دیر شەوی سەرۆکی مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی زانایانی ئیسلامی کوردستان و مەلا تەها شەمزینی ئەندامی مەکتەبی تەنفیزی کرد. سەرەتا بەڕێز وەزیری ئەوقاف بەبۆنەی هەڵبژاردنی سەرۆك و ئەندامانی تازەی یەکێتی زانایان بەناوی وەزارەتەوە پیرۆزبایی لێ کردن و هیوای سەرکەوتنی بۆ خواستن پاشان لەدیدارێکدا باس لەئەرکە هەنووکەییەکانی ئایینی ئیسلامی پیرۆزکراو بەڕێزیان پشتگیریان دەربڕی لەوەزارەتی ئەوقاف و حکومەتی هەرێم و کاروچالاکیەی خزمەت گوزارییەکانی حکومەتی هەرێم و وەزارەتی ئەوقاف هەڵسەنگێنردرا پاشان تیشك خرایە سەر کەم و کورتییەکان کەلەبەدااهاتوودا لەلایەن وەزارەتی ئەوقاف جێبەجێ دەکرێت و قودسیەتی مزگەوتەکانی دەپارێزرێن بۆ خواپەرستی و پەروەردەی ئاینی ئیسلامی پیرۆز.





* ڕۆژی ١٠/١٠ بەڕێز مەحمود کاوە حەفید زادە وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی بەڕێزان مەلا ئەحمەدی خانەقا بریکاری وەزارەت و حاکم جەمال بەڕێوەبەری گشتی دیوان پێشوازی لەبەڕێز د.شێرزاد ئەحمەد نەجار یاریدەدەری سەرۆکی ئەنجوومەنی خوێندنی باڵا لەسەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران کرد.

لەدیدارێکدا، گفتوگۆ لەسەر قوتابیانی خوێندنی ئیسلامی قوتابخانەکانی ئاینی وەزارەتی ئەوقاف کرا، سەبارەت بەوەرگرتن و تەواوکردنی خوێندن لەبەشی خوێندنی ئیسلامی لەکۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین و کۆلیژی شەریعەی زانکۆی دهۆک، ئەمەو چەند پێشنیارێک بەمەبەستی یاسای خوێندن خرایە روو گفتوگۆی لەسەر کرا.

پاشان بەڕێز وەزیری ئەوقاف تەئکیدی لەسەر گرنگی خوێندنی ئیسلامی وەرگرتنیان لەزانکۆکانی هەرێم کردەوە، پشتگیری خۆی بۆ هاوکاری کردنی زانکۆکانی کوردستان نیشان داو ئومێدی سەرکەوتنی بۆ خواستن.



* ڕۆژی ١٤/١٠/١٩٩٨ بەڕێز مەحمود کاوە حەفید وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی بەڕێز حاکم جەمال بەڕێوەبەری گشتی دیوانی وەزارەت سەردانی کۆمەڵگای کەسنەزانیان لەشاری هەولێر کردو لەلایەن ریش سپی و پیاو ماقوڵان، مامۆستایانی ئاینیەوە پێشوازیان لێ کراو مزگەوتی گەورەی کەسنەزانیان بەسەر کردەوەو لەکەم کورتیەکانیان کۆڵیەوە بڕیاریاندا بەزووترین کات و چاك بکرێنەوە بەمەبەستی خزمەت گەیاندن بەئایینی پیرۆزو جێبەجێ کردنی ڕاسپاردەکانی کابینەی سێیەمی حکومەتی هەرێم. ئەمەو بەڕێوەبەری ئەوقافی هەولێرو ئەندازیارانی وەزارەت یاوەری بەڕێزیان بوون.

* ڕۆژی ١٨/١٠ بەڕێز مەحمود کاوە حەفید زادە وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەئامادەبوونی بەڕێز فەلەکەدین کاکەیی وەزیری ڕۆشنبیری لەنووسینگەی خۆی لەدیوانی وەزارەتدا پێشوازی لەبەڕێز حاجی ئاغای ڕەمەزانی نوێنەری تایبەتی ڕابەری کۆماری ئیسلامی ئێران لەقەرارگای ڕەمەزان و وەفدێکی یاوەری کرد کەبێك هاتبوو لەبەڕێزان (ئاغای سلێمانی و ئاغای دانشی)و (عبداللە صالح) بەرپرسی پەیوەندیە گشتییەکانی پارتی دیموکراتیکوردستان لەکۆماری ئیسلامی ئێران، لەدیدارێکی دۆستانەدا گفتوگۆ لەسەر پەیوەندی برایانەی نێوان موسڵمانانی کوردستان و ئێران کراو پەیوەندی هەردوولا قسەو باسی لەسەر کراو تیشك خرایە سەر کاروباری وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی و پتەو کردنی پەیوەندییە هەنوکەییەکان و چەسپاندنی ئاشتی لەکوردستاندا ئەمەو لەم دیدارەدا بەڕێز مەلا ئەحمەدی خانەقا بریکاری وەزارەت و حاکم جەمال بەڕێوەبەری گشتی دیوانی وەزارەت ئامادەبوون.





هەواڵ و ریپۆرتاژ

## شکۆمەندی دوو ساڵ تەمەنی کابینەی سێهەم و

# پرۆژەو چالاکیە خزمەتگوزاریەکانی وەزارەتی ئەوقاف

**حەمە جاف - عەدنان کاکە**



کابینەی سێیەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەماوەی ئەم دوو ساڵەی تەمەنیدا لەرێگای ئەنجامدانی کارو چالاکیەکانی سەلماندویەتی کەکابینەیەکی خزمەتگوزارەو لەخزمەتی هاووڵاتییانو جەماوەری بەش مەینەتی هەرێمی کوردستاندایە، دیارە وەزارەتی ئەوقافو کاروباری ئیسلامیش یەکێکە لەو دامودەزگاو وەزارەتانەی، هەر لەسەرەتای دەست بەکاربوونیەوە تا ئەمڕۆ بەردەوامە لەپێشکەش کردنی کارو چالاکیو پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی ئایینی لەپێناوی چاک کردنی باری ژیانو گوزەرانی مامۆستایانو زانایانی ئایینی هەرێمو پشتگیری کردنو هاریکاری ماددیو مەعنەوی پەککەوتەکانو نابیناو بی ئەواوو بێ سەرپەرشتان کەئەمەش خۆی لەخۆیدا ئەرکێکی گرنگی سەرشانی کابینەی سێهەمی خزمەتگوزاری حکومەتو وەزارەتی ئەوقاف خۆیەتی، کەلەرۆشنایی راسپاردەو رێنماییەکانی بەڕێز جەنابی سەرۆک بارزانی، سەبارەت بەخزمەت کردنی هاووڵاتیانو مامۆستایانو زانایانی ئایینی ئیسلامی پیرۆز کارەکانی جیبەجێ کردووە، ئەمەو وەزارەتی ئەوقافو کاروباری ئیسلامی لەکاتی دەست بەکاربوونی کابینەی سێهەمی حکومەتی هەرێمەوە لە٢٦/ئەیلولی ساڵی ١٩٩٦ەوە تاوەکو مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٩٨ زیاتر لەبڕی (٧) ملیۆنو (١٦٥) هەزارو (٢٢٠) دیناری لەپرۆژەو چالاکییە خزمەتگوزارییەکانی خۆی لەبواری چاک کردنەوەو دروست کردنو نۆژەن کردنەوەی مزگەوتو تەکیەو شوێنە پیرۆزە ئایینیەکان لەهەرێمدا سەرف کردوە، جگە لەچالاکی دیکەی جۆراوجۆر کەلەو ماوەیەدا ئەنجام دراون. هەر بەم بۆنەیەشەوە بەڕێز (**مەحمود کاوە حەفید زادە**) وەزیری ئەوقافو کاروباری ئیسلامی سەبارەت بەکاروچالاکیو پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی وەزارەت لەتەمەنی پڕ شکۆی کابینەی سێیەمەوە تا ئەمڕۆ، بەم شێوەیە بۆ گۆڤارەکەمان هاتە ئاخاوتن:

* سەبارەت بەپرۆژەو چالاکییەکانی وەزارەتمان، بەردەوامین لەپێشکەش کردنی پرۆژەو چالاکی لەپێناوی زیاترو باشتر خزمەت گەیاندن بەمامۆستایانو زانایانی ئایینیو دەست گیرۆیی کردنی هاووڵاتیانی هەژارو نابیناو کەم دەرامەتانو هاوکاری کردنی قوتابیانی قوتابخانەکانی ئایینیو نۆژەن کردنەوە، دروست کردنی مزگەوتو تەکیەو خانەقاو شوێنە پیرۆزەکانو بلاوکردنەوەی چاپەمەنیو سازکردنی ئاهەنگی بۆنە پیرۆزەکانو کردنەوەی بەدەیان پێشانگاو بۆنەی پیرۆزو کۆڕو سیمیناری ئایینی، بۆ ئەم مەبەستەش لەماوەی تەمەنی ئەو دوو ساڵەی کابینەی سێیەمی خزمەتگوزارو دامەزراندنی پۆستی وەزارەتەکەمانەوەو لەژێر رۆشنایی رەزامەندی بوونی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانو وەزارەتی دارایی و بەسەرپەرشتی وەزارەتی ئەوقافو کاروباری ئیسلامی بەدیاری کردنی (گۆژمە پارەی تایبەت) چەندین چالاکیو پرۆژەمان بەئەنجام گەیاندوون لەوانە:



## پرۆژە خزمەتگوزاریەکانی ١٩٩٦-١٩٩٧

لەهەردوو بودجەی ساڵی ١٩٩٦و ١٩٩٧ی وەزارەتەکەمان بەم شێوەیە پرۆژەکانی جێبەجێ کردوون:

* چاک کردنەوەی هەر سێ باڵەخانەی وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێرو قوتابخانەکانی ئاینی کەبڕی (١٢٠ر٦٩٠) هەزار دیناری بۆ تەرخان کراوە.

* پڕ کردنەوەی شوێنی پێویست لەبەڕێوەبەرایەتییەکان لەڕێگای دامەزراندن.

* پڕکردنەوەی ئیستمارەی (کورتەی ڕاژە) بۆ ئاسان کردنی ئیش و کاری ڕۆژانە کەئەمەش بوتە هۆی گەڕانەوەی پارەیەکی زۆر بۆ گەنجینەی هەرێم.

* دانانی (ملاحظیة)یەک بۆ حەوزی سوران بۆ ئاسان کردنی کاروباری ڕۆژانەی ئەوقافی هەولێر

* دانانی ئەنجومەنی زانستی لەوەزارەتی ئەوقاف بەمەبەستی تاقیکردنەوەی مامۆستایانی ئاینی کەلەوەزارەت بەپلەی فەرمانبەری ئاینی دادەمەزرێن.

* دامەزراندن و خانەنشین کردنی فەرمانبەران لەدیوانی وەزارەت.

* ناردنی وەفدێکی باڵا بەسەرۆکایەتی بەڕێزان بریکاری وەزارەت و بەڕێوەبەری گشتی دیوان بۆ دەرەوەی وڵات بەمەبەستی سازدانی سەفەری حەج بۆ هاووڵاتیانی موسڵمانی کوردستان.

* تەعدیل کردنی بڕوانامەکانی دواناوەندی قوتابخانەکانی ئاینی بەمەبەستی تەواوکردنی دیراسەت لەپەیمانگای ئیسلامی و کۆلیژەکانی تایبەتمەندی ئاینی کەبڕی (٨٠٠٠) دیناری بۆ تەرخان کراوە.

* سەرژمێرکردنی سەرجەم مزگەوت و تەکیەو شوێنە پیرۆزەکانی لەئاینی هەولێرو دەوروبەری سەبارەت بەکۆکردنەوەی زانیاری و چارەسەرکردنی کێشەکانیان.

* کردنەوەی قوتابخانەیەکی ئاینی لەکۆمەڵگای (بەحرکە) لەسنووری پارێزگای هەولێر.

* کردنەوەی چوار خولی فێرکردن و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز لەشاری هەولێر.

* کردنەوەی خولێکی فێرکردن و لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز لەناوچەی نەهلە لەئاکرێ.

* کڕین و چاپ کردنی کتێبی مەنهەجی بۆ قوتابخانەکانی ئاینی بەگوژمە پارەی (٢٥٥ر٠٠٠) هەزار دینار.

* دابین کردنی جلوبەرگ بۆ قوتابیان لەهەردوو پارێزگای هەولێرو دهۆک بەگوژمەی (٥٢٥ر٠٠٠) هەزار دینار.

* زیاد کردنی دەرماڵەی قوتابیانی نابینا لە(٧٠) دینارەوە بۆ (١٠٠) دینار.

* بەخشینی پاداشت بۆ پلە یەکەمەکان لەئەزموونەکانی وەزاری قوتابخانەکانی ئاینی.

* کردنەوەی ئامۆژگاری پێش نوێژان لەهەولێرو دهۆک و ئاکرێ.

* ئامار کردنی گشت موڵکەکانی ئەوقاف لەپارێزگای هەولێردا.

* کردنەوەی چەند خولێک بۆ مامۆستایانی ئاینی و وتار بێژانی پارێزگای هەولێرو دەوروبەری بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری ئیسلامی لەبواری شەریعەتدا.

* هاریکاری کردنی هەموو ئەو پرۆژانەی کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئەندازەو ئاوەدان کردنەوەی وەزارەتەوە بەئەنجام دەگەیەندرێن بەگوژمەی تەرخان کراو بۆیان.

* پێشبڕکێی هەڵبژاردن و دیاری کردنی پاک و خاوێن ترین مزگەوت لەپایتەختی هەرێمدا.

* چاک کردنەوەو دروست کردنی چەند پرۆژەیەکی خزمەتگوزاری ئاینی لەوانە مزگەوت و تەکیەو چەند شوێنێکی پیرۆزی ئاینی لەسنووری هەردوو پارێزگای هەولێرو دهۆک و قەزای ئاکرێ و زاخۆ کەهەر هەموویان (١٠٣) پرۆژەن و گوژمەی (٣) ملیۆن و (٢١١) هەزارو (٣٠٤) دیناری تێ چووە.

* دروست کردنی مزگەوتێک و بازاڕگایەک لەپارێزگای دهۆک بەشێوەی (موساتەحە) کەبڕی (١ر٢٠٠ر٠٠٠) ملیۆنێک و دوو سەد هەزار دیناری بۆ تەرخانکراوە.

* دروست کردنی (٥٣) دوکان لەقەزای زاخۆ بە(موساتەحە) بەبڕی (١ر١٠٠ر٠٠٠) یەک ملیۆن و سەد



هەزار دینار.

* دروست کردنی ڕێزێك دوكان بەشێوەی (موساتەحە) لەسەر زەوی ژمارە (٥٦٧- خانەقا) کەبڕی (٢٥٠،٠٠٠) هەزار دیناری بۆ تەرخان کراوە.

* بڕی (٩٧٠ر٩٨١ر١) ملیۆن دینار بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی وەزارەتو سازدانی بۆنە ئایینیەکانو کڕینی پێداویستی هەر سێ بەڕێوەبەرایەتییەکانی ئەوقافی هەولێرو سلێمانیو دهۆك.

* لەماوەی (٣٠) ڕۆژی مانگی ڕەمەزانیشدا، بەرنامەی تایبەتی ئاینیمان لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندن لەهەرێمدا پێشکەش کردووە لەگەڵ سازکردنی خوانی بەربانگ بۆ مامۆستایانی ئایینی.

* ئامادەکردنو پێشکەش کردنی بەرنامەی هەفتانە بەناوی (ئاسۆی ئیسلام) لەتەلەفزیۆنی هەرێم بۆ بەرزکردنەوەی ڕاگەیاندنو ئیرشاداتی ئایینی لەکوردستاندا کەبەردەوامە لەکارکردن.

* سازدانو ئامادەکردنی (٧) مێزگەرد بۆ ژمارەیەك لەمامۆستایانی ئایینی لەپێناو هەڵسەنگاندنو چارەسەر کردنی کێشەی کۆمەڵگای کوردەواری.

* سازدانی مێزگەرد بۆ یادی (١٦)ی ئابو بەدیارخستنی ڕۆڵی بارزانی نەمر لەخزمەت کردنی ئایینی ئیسلامو ڕۆڵی کاریگەری مامۆستایانی ئایینی لەهەردوو شۆڕشی ئەیلولو گوڵاندا بۆ هۆشیار کردنەوەی خەڵکی موسڵمانی کورد.

* هەوڵدان بۆ بەشداری کردن لەفەریزەی حەج لەهەرێمدا.

* سازدانی دوو کۆڕی ماتەمینی بەهاوکاری یەکێتی زانایان بۆ هەردوو زانایانی ئایینی (مەلا عارف زیباریو مەلا یاسین) کەبەدەستی تیرۆریستانی ئاین شەهید کران.

* خەرج کردنی بڕی (٨٠٥ر١٥٠ر١) ملیۆن دینار وەك موچەی مانگێك بۆ فەرمانبەرانی هەردوو بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی سلێمانیو کەرکوكو کۆیە کەژمارەیان (٣٥٨٧٠) فەرمانبەر بوو بەهەموو جۆرێکەوە بەفەرمانی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران.

* گەڕاندنەوەی ئیراداتو داهاتی وەزارەتی ئەوقافو کاروباری ئیسلامی لەهەردوو پارێزگای هەولێرو دهۆك (٥٠٩ر٤٢٤ر١) ملیۆن دینار بۆ گەنجینەی حکومەتی هەرێمی کوردستانو سوود لێ وەرگرتنی بۆ پرۆژە خزمەتگوزارییەکان لەهەرێمدا.

خەملاندنی موڵکەکانی ئەوقاف سەرلەنوێ لەهەردوو پارێزگای هەولێرو دهۆك بۆ ساڵی (١٩٩٧) بەهۆی گۆڕانکاری بارودۆخی ئابووری هەرێم.

* کونترۆڵ کردنی زیاتر لە(٤٣٥) پارچەی زەوی ئەوقافو گەڕانەوەی بۆ گەنجینەی هەرێم لەسەرجەم گوندو شارو شارۆچکەکانی پارێزگای هەولێردا.

* چاك کردنەوەو دروست کردنی زیاتر لە(١١٩) مزگەوتو تەکیەو شوێنی پیرۆزی ئایینی لەساڵی (١٩٩٧)دا کەبەتێ چوونی بڕی (٦٦٦ر٣٤٩ر٣) ملیۆن دینار مەزەندە کراوە جگە لەوەی کەلە(هەشت) مانگی ڕابردووی ساڵی (١٩٩٨)دا زیاتر لە(١٢٤) مزگەوت دروست کراوەو نۆژەن کراوەتەوە کەبڕی (٤٣٤ر١٢٥ر٣) ملیۆن دیناری تێ چووە.

* کردنەوەی (ملاحظیة)ی ئاگرێ بۆ ئاسان کارییەکانی دەڤەری ناوبراو.

* سازدانی دوو خوان بۆ مامۆستایانو فەقێیەکان لە(کۆشکی زێڕین) لەپایتەخت بەبۆنەی ڕۆژی (ئیسراو میعراجی) پیرۆزەوە.

* کۆڕێك بۆ قورئان خوێنانو وتار بێژان بەنیازی دیاری کردنی باشترین قورئان خوێن لەهەرێمدا.

* سازدانی مێزگردێك بۆ مامۆستایان (عەبدوڵڵا فەرهادیو مەلا شەفیعو مەلا لەتیف).

* ئامادەکردنی کۆڕێکی تایبەت بۆ مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا فەرهادی.

* تۆمارکردنی (وەعز) لەڕۆژانی ڕەمەزاندا بۆ کەناڵی TV هەرێم.

* دابەش کردنی خەڵات بەسەر قوتابیانی قوتابخانەکانی ئەهلی ئایینی.

* دامەزراندنی زیاتر لە(٣٤) پێش نوێژو قورئان خوێنو خزمەتگوزار لەمزگەوتەکاندا.



دەرکردنی مۆڵەتی گۆڤارێکی دەری بەناوی (خۆری ئیسلام) کەلایەن نووسینگەی ڕاگەیاندنی وەزارەتەکەمانەوە سەرپەرشتی چاپ و بلاوکردنەوەی دەکرێت کەلەڕۆژی ١٦ ١١ ١٩٩٧ مۆڵەتی ژمارە (١٢٢١)ی لەوەزارەتی ڕۆشنبیری بۆ پێدراوەو یەکەم ژمارەشی لەمانگی ڕەبیعول ئەوەلی ساڵی ١٤١٩ی کۆچی بەرامبەر مانگی تەمموزی ١٩٩٨ زایینی. دەرچووە.

* دابەش کردنی سەرتۆکی ئایینی بەسەر گشت قوتابخانەکانی ئایینی کەلەسەر بوودجەی وەزارەتی ئەوقاف چاپ کراون.

* تەنسیب کردنی فەرمانبەرانی ئایینی پارێزگای سلێمانی لەبەڕێوەبەرایەتییەکانی ئەوقافی هەولێرو مزگەوتەکاندا لەگەڵ پێدانی موچەکانیان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک

**کۆی گشتی گوژمەو پرۆژەکان**

ئەمەو بەڕێزیان بەکورتی ئامارەی بەوە کرد کەکۆی گشتی گوژمەی دیاری کراوو تێچوی چاککردنەوەو دروست کردنی مزگەوت و تەکیەو شوێنی پیرۆزی ئایینی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئەندازەو ئاوەدانکردنەوەی وەزارەتەکەمانەوە لەساڵی (١٩٩٦-٣١/٨/١٩٩٧) بەم جۆرەیە:

* چاک کردنەوەی هەرسێ باڵەخانەی وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێرو قوتابخانەی ئایینی هەولێر (بەبڕی ١٢٠ر٦٩٠) هەزار دینار.

* دروست کردنی (٤) مزگەوت لەڕەواندزو سوسێ و مێرگەسوورو کەپران و هەروەها چاک کردنەوەی (١١٥) مزگەوتی دیکە لەگوندو شارو شارۆچکەکانی هەرێمدا کەبڕی (٣ر٣٤٩ر٦٦٦) ملیۆن دیناری تێ چووە.

**پرۆژە چالاکییەکانی ئایندەی وەزارەت**

ئەمەو بەڕێز (مەحمود کاوە حەفید زادە) وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی سەبارەت بەبەرنامەی کارو چالاکییەکانی ئایندەی وەزارەت گوتی:

* هەروەك چۆن وەزارەتەکەمان لەسەرەتای تەمەنی دەست بەکاربوونی کابینەی سێیەمی خزمەتگوزارەوە. دریغی لەئەنجام دانی کارو چالاکییە خزمەتگوزارییەکانی ئایینی نەکردووە لەپێناوی خزمەت کردن بەهاوولاتیان لەڕێگای ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکانی ئایینی و دەست گرتنی کەم دەرامەت و هاوکاری کردنی هاوولاتیانی هەژارو نابینا و بێ سەرپەرشتان، هەرگیزاو هەرگیزش دریغی لەو هاوکاری کردنە لەڕێگای پێشکەش کردنی پرۆژەکانەوە ناکات کەخوا یار بێت لەبەرنامەماندا هەیە. چەند پرۆژەیەکی گرنگترو گەورەتر بەئەنجام بگەیەنین لەوانە:

* چاککردنەوەو دروست کردنی چەندین مزگەوت و شوێنی پیرۆزی ئایینی دیکە لەناوچە جیاجیاکانی هەرێمی کوردستاندا

* سەبارەت بەپرۆسەی دابەش کردنی زەوی کەلەلایەن سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتی شارەوانی بڕیاری لەسەر دراوە لەوەزارەت دوو لیژنەمان بەمەبەستی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون پێك هێناوە بەدەست نیشان کردنی کەسانی موستەحەق بۆ وەرگرتنی زەوی و دابەش کردن کەئیستا لەقۆناغی جێبەجێ کردن دایە

* ئەنجامدانی پرۆژەی چاپ کردنی کتێب و دەست نووس و مەختوتاتی ئایینی لەلایەن وەزارەتەوە

ئەمەو بەبیسبەت دروست کردن و نۆژەن کردنەوەی باڵەخانەکانی مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکانی ئایینی بڕیار وایە لەئایندەیەکی نزیکدا، لەهەردوو قەزای شەقلاوەو ناحیەی سەلاحەدیندا (٢) قوتابخانەی ئایینی دروست بکرێن کەبڕی یەك ملیۆن دیناریان بۆ تەرخان کراوە.

هەروەها دروستکردنی باڵەخانەیەك بۆ ئەوقافی پارێزگای دهۆك کەبڕی (٣) ملیۆن دیناری بۆ دابین کراوە، لەگەڵ دروست کردنی (٥) هۆڵی بۆنە (مناسبات) کەنزیکەی (١) ملیۆن دیناری تێ دەچێت.

ئەمە جگە لەدروست کردنی (٢٠) مزگەوت لەهەردوو پارێزگای هەولێرو دهۆك و ناوچەی ئاکرێ و زاخۆ کە(٥) ملیۆن دیناریان بۆ تەرخان کراوە.



## دوا وتەو پیرۆزبایی

ئەمەو بەڕێزیان لەکۆتاییدا گوتی:

ویڕای پیرۆزبایی و دەست خۆشانەی گەرممان بۆ هەوڵە پیرۆزەکانی کابینەی سێیەمی خزمەتگوزار، پێویستە لەسەرمان بەهەموو تواناکمانەوە، هاوکاری حکومەتەکەمان بکەین لەپێناوی زیاتر پێش خستنی هەوڵ و کاروچالاکییەکانی سەبارەت بەچاك کردنی باری ژیان و گوزەرانی خەڵکی حوراگری کوردستان لەئاوەدان کردنەوەی هەرێمدا.

* پێکەوە بەرەو وڵاتێکی ئاوەدان و ئاوەدان کردنەوەی هەرێمی کوردستان

## پرۆژەو چالاکییەکانی ساڵی ١٩٩٨

* بەڕێز مامۆستا مەلا ئەحمەدی خانەقا بریکاری وەزارەت سەبارەت بەپرۆژەو چالاکییەکانی وەزارەت بەهەشت مانگی رابردووی ساڵی (١٩٩٨)دا بەپێی بوودجەی تەرخان کراوی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بەم شێوەیەی سەرژمار کردو گوتی:

* دابین کردنی زیاتر لە(١٠) هەزار قورئانی پیرۆز بۆ تێکڕای مزگەوتەکانی هەرێمی کوردستان.

* کردنەوەی بەدەیان خولی بەهێزکردن و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بۆ مامۆستایانی ئاینی و قوتابیانی قوتابخانەکانی ئاینی و حەلات کردنیان.

* دامەزراندنی تیپی سروودی ئاینی (فرقە الانشاد الدینیە) بۆ گشت بۆنە ئاینییەکان.

* کردنەوەی خولی (تەجویدو حفظ ی قورئانی پیرۆز لەسەرجەم مزگەوتەکانی هەرێمی کوردستان بەمەبەستی بەهێزکردنی وتارخوێن و قورئان خوێنانی هەرێم.

* سازدانی ئاهەنگی دەرچوانی قوتابیانی قوتابخانەکانی ئاینی و حەلات کردنی قوتابیە سەرکەوتووەکان.

* حەلات کردن و دامەزراندنی ئەو قوتابیانەی کەبەپلەی ئیمام و خەتیب دەردەچن کەئەمەش خۆی لەخۆیدا حیبەجێ کردنی بریارێکی سەروکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانە.

* دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (خۆری ئیسلام) کەوەزارەتی ئەوقاف سەرپەرشتی چاپ و بلاوکردنەوەی دەکات بەگوژمەی (٤٠٠٠) چل هەزار دینار وەرزانە، دیارە ژمارەی دووەمیش ئێستا لەبەر دەستی ئێوەی ئازیزدایە.

* بەبۆنەی یادەوەری لەدایک بوونی پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) بڕی (٢٥٠) دینارمان وەك دیاری و خەلات پێشکەشی بەوتاربێژانی مزگەوتەکان کردووە.

* لەرۆژی (٦) تەمموزی ساڵی ١٩٩٨دا بەبۆنەی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری مەزن (ﷺ)، لە(٨) مزگەوتی پایتەختی هەرێمدا ئاهەنگ سازکرا، کەراستەوخۆ لەلایەن وەزارەتەوەسەرپەرشتی سازدانی دەکرا.



* بەخشینی بڕی ٥٠٠ دینار پارمەتی وەك جەژنانە بۆ ئیمام و خەتیبی مزگەوتەکانی شاری هەولێر

* دابین کردنی بودجەیەك بۆ هاوکاری کردنی زیاتر لە(٢٨) قوتابخانەی ئەهلی ئاینی لەسەرجەم پارێزگاکانی هەرێمی کوردستاندا

* دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی پیشەیی سەربەخۆی ئاینی بۆ هەڵبژاردنی باشترین وتاربێژو قورئان خوێن لەهەرێمدا بەرانبەر برینەوەی موچەی تایبەت بۆیان.

* سازدانی کۆڕو کۆبوونەوەو مێزگردو سیمیناری ئاینی بۆ مامۆستایانی ئاینی و پسپۆرانی ئەو بوارە.

* بەبۆنەی رۆژی پیرۆزی ١٤/٣ یادی لەدایك بوونی (بارزانی ئەمر)ەوە پرۆژەی ئەمام چاندنمان سازدا، جگە لەسازدان و کردنەوەی چەند پێشانگای هەمەجۆری هونەری و خۆشنووسی و مەختوتاتی ئاینی لەهەردوو هۆڵی وەزارەت و بۆنە ئاینییەکان.

* کردنەوەی پێشانگایەکی مەختوتی ئیسلامی و پێشانگایەکی



خۆشنووسی بەهاوکاری کۆمەڵەی خۆشنووسانی کوردستان و دابەش کردنی خەڵات و دیاری وەزارەت بەسەریاندا.

* بەسەرکردنەوەی سەرجەم مزگەوتەکانی شارو شارۆچکەو گوندەکانی سنووری کابینەی سێهەم بەمەبەستی چارەسەر کردنی کێشەو پڕکردنەوەی کەم و کوڕیەکانیان.

* لەمانگی ڕەمەزاندا، چەند خوانێکی بەربانگ بۆ مامۆستایانی ئایینی و خوێندنی (وەعز) لەڕێگای کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی هەرێمەوە بەسەرپەرشتی وەزارەت سازکراوە

* یاد کردنەوەی ئیسراو میعراج بەشێوەیەکی جوان و ڕێکوپێک.

* دابین کردنی بڕی (١١) هەزار دینار بۆ کڕینی پێداویستی نووسینگەی ڕاگەیاندنی وەزارەت لەگەڵ دابین کردنی کۆمپیوتەرێک بۆ کاروباری چاپەمەنی وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتییەکانی سەر بەوەزارەت.

* سازکردنی چەند ئاهەنگێکی ئایینی بەبۆنەی جەژنی پیرۆزی سەری ساڵی کۆچی و جەژنی (موحەرەم) و چەند بۆنەیەکی دیکەی ئایینی.

* کردنەوەی چەند خولێکی فێرکردن و لە بەرکردنی قورئانی پیرۆز زیاتر لە(١٠) مزگەوتی ناو شاری هەولێر.

* کردنەوەی خولێک بۆ پێش نوێژ و وتار خوێندنی دەرچووی پەیمانگای وتار خوێنان و قوتابیانی دەرچووی ئامادەیی ئیسلامی.

* کردنەوەی پێشانگایەکی هونەری شێوەکاری بەبۆنەی ١٦ی ئاب لەهۆڵی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی سلێمانی.

* تاقیکردنەوەی (١٦) مامۆستای ئایینی خاوەن بڕوانامەی زانستی بەمەبەستی یەکسان کردنی بڕوانامەکانیان بەبڕوانامەی دەرچووی شەشەمی ئامادەیی خوێندنی ئیسلامی.

* دامەزراندنی (٥١) پێش نوێژ بۆ مزگەوتەکان و هەژمارکردنی خزمەتی دەرەوەی فەرمانگەی میری بۆ زیاتر لە(٣) پێش نوێژ.

* کۆکردنەوەی داهاتی مانگی (٨) کەبریتییە لەکرێی مانگانەی موڵکەکانی (وەقف) بەگوژمە پارەی (٤٢٨٠٥) هەزار دینار.

* دانانی دەرخستەی پێویست بۆ چاک کردنەوەی (٢٤) مزگەوت لەناوەندو دەوروبەری پارێزگای دهۆک بەگوژمەی ٤٠٩١٠١ دینار لەڕێگای بەڵێندەرەوە.

* سەرپەرشتی کردنی کاروباری موڵکەکانی (وەقف) لەپارێزگای دهۆکدا.

* دانانی کاری چاک کردنەوەی (١٥) مزگەوت لەشارۆچکەی شەقڵاوەو هەریرو دەوروبەری لەڕێگای بەڵێندەرەوە بەگوژمەی (-ر٨٦٦٥٠) هەزار دینار.

* کردنەوەی پرۆژەی فراوان کردنی مزگەوتی قەزای مێرگەسوور کەگوژمەی (-ر٣٢٠٢٩٩) دیناری تێ چووە.

**بەو ئومێدەی زیاتر خزمەتگوزاری پێشکەش بکەین**

* ئەمەو بەڕێزیان لەدرێژی لێدوانەکەیدا سەبارەت بەجێبەجێ کردنی پرۆژەو چالاکییەکانی بەشی ئەندازەو ئاوەدانکردنەوەی وەزارەت دەربارەی ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکانی ئایینی لەهەرێمدا گوتی:

* یەکەم بودجەی ساڵی ١٩٩٩ی حکومەت کەپەسند کرا، بودجەی وەزارەتی ئەوقاف بوو

* بەپێی بودجەی ساڵی (١٩٩٨)ی وەزارەتەکەمان تا ئێستا (١٢٤) پرۆژە لەچاک کردنەوەی مزگەوت و تەکیەو شوێنە پیرۆزەکان لەهەردوو سنووری پارێزگای هەولێرو دهۆک بەئەنجام گەیشتوون کەگوژمەی پارەی (٢٧٤ر٢١٦ر٢) ملیۆن دیناری تێ چووە. ئەمە جگە لەچاککردنەوەی مزگەوتی گەورەی شەقڵاوە کەبڕی (١٦٠ر٥٠٩) هەزار دیناری تێ چووە. کەکۆی گشتییان دەکاتە (٤٣٤ر١٢٥ر٣) ملیۆن دینار. بێگومان بەردەوامیشین لەهەڵمەتی دروست کردن و نۆژەن کردنەوەی مزگەوتەکان و شوێنە پیرۆزەکانی ئایینی. گەر خوای گەورە فرسەتمان بۆ برەخسێنێ. ئیتر بەو ئومێدەی بتوانین لەئایندەداو بەپشتیوانی یەزدان زیاتر خزمەت پێشکەش بەگەلە مەزلومەکەمان بکەین.





# هەواڵەکانی جیهانی ئیسلامی

## ■ کۆسۆڤۆ

### هێزەکانی سربیا لەدژی هێزەکانی سوپای رزگاری کۆسۆڤۆ دەست بەهێرشێکی گەورەی فراوان دەکەن

هەواڵەکان وا رادەگەیەنن کەهێزەکانی ئاسایشی سربی خۆیان بۆ پەلاماردانێکی گەورە ئامادە دەکەن کە لەدژی هێزەکانی سوپای رزگاری کۆسۆڤۆ ئەنجامی بدەن. ئەو هێزەش نێستە خۆی لەشارۆچکەی - بیلاکیفتش- قایم کردووە کە ١٠ کیلۆمەتر لەرۆژئاوای بریشتینای پایتەختی کۆسۆڤۆ دوورە.

پۆلیسەکانی ئاسایش کەپاڵتۆی گوللەبەندیان لەبەرکردووەو چەکی کلاشینکۆفیان بەدەستەوەیە. بەپشتگیری ئۆتۆمبیلی چەکدار. دەستیان بەسەر رێگەی نێوان بیلاکیفتش و بریشتینایاندا گرتووە.

لەدوای ئەمەش رێگەیان لەرۆژنامەوانان گرت و نەیان هێشت کەس لەو دەڤەرە هاتوچۆ بکات.

لەترسی ئەمەشدا خەڵکی مەدەنی بەگشتی لەدەڤەرەکە رایانکردو ئاوارەی سنووری ئەلبانیا بوونەوە. وا دەردەچێت هێزی ئاسایشی سربیایەکان بەستیان بەسەر زۆربەی



دەڤەری کۆسۆڤۆدا گرتووە.

بەرپرسێک لەباڵیۆزخانەی ئەمەریکی گوتی. کریستۆفەر هیڵی باڵیۆزخانەی ئەمەریکی بڕیارە لەگەڵ سەرۆکی یۆگۆسلاڤی- سلۆبۆدان میلۆسۆفیتش لەبەلگراد کۆببێتەوە. بەلام ئەوەی ئاشکرا نەکرد کەلەکۆبوونەوەکە چی باس دەکرێت.

زانیاری باسە لە٩٠٪ی خەڵکی دەڤەری کۆسۆڤۆ موسوڵمانن و ماوەی ٤ مانگە لەسەدا ٢٠ی خاکی دەڤەرەکە لەژێر کۆنترۆڵی سوپای رزگاری کۆسۆڤۆیە.

## ■ سوودان

لەباشووری سوودان شەڕێکی توندوتیژ دەستی پێکردووە مەشخەڵەکەی سالی ١٩٨٣ هەڵگیرساوە. ئەم شەڕە لەنێوان گاورو موسوڵمانەکان تا ئێمڕۆش درێژەی هەیە. کەمینە گاورەکان لەباشووری سوودان داوای جیابوونەوە دەکەن و حکومەتی خەرتوومیش تائێستە ملکەچی داواکاری جوداخوازەکان نەبووەو بەهیچ جۆرێك نایەوێت وڵاتەکە دوو کەرت بکرێتەوە.

## ■ سیرالیۆن

لەو ماوەیەی دوایدا هێزەکانی سەر بەدەوڵەتانی رۆژئاوای ئەفەریقیا (نیکۆموگ، قەسابخانەیەکی دڵتەزێنیان لەنێو خەڵکی ئەم وڵاتە هەژارە ئەنجام داوە. خەڵکی مەدەنییان لەگوندو شارۆچکەو رێگەو بانەکاندا کوشتووە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی بەپەلە داوای ئاگر بەست بکات و هێزەکانی نایجیری ئاگەدار بکاتەوە کەئەو شەڕو کوشتارەی ئەوان دەیکەن خەڵکێکی زۆری ئاوارە



كردووەو لەمەشدا باری مرۆیی لە-فریتاون-ی پایتەخت تێكچووە.

## ■ جەزایر

ئەمین زەروالی سەرۆكی حكومەتی جەزایر ڕایگەیاند كەلەناوەڕاستی مانگی شوباتی ساڵی داهاتوو دەست لەكاروباری دەوڵەت دەكێشێتەوە. ئەوەی زەروال ڕایگەیاند لەهیچ دەوڵەتێكی ئیسلامیدا نەبووە. بەڵام دەشبێت ئەم هەنگاوەی زەروال ئەوە بێت كەنەتوانێت چی دیكە ڕووبەڕووی سەربازە پلە دارەكان ببێتەوە. یا ئەگەر لیژنەیەكی نێو دەوڵەتی ئەوەی سەلماند كەسەربازە پلەدارەكان دەستیان لەكوشتنی موسوڵمانەكاندا هەیە. ئەو ئەتوانێت دادگەییان بكات و بەمەش لەئێستەوە گۆڕەپانی سیاسییان بۆ بەجێ دەهێڵێت. مشتومڕێكی زۆر لەنێو خەڵكدا هەیە گوایە دەستە سەربازییەكانی پاراستنی ئاسایش دەستیان لەكوشتنی موسوڵماناندا هەیە بەتایبەتی ئەوەی لەو دوو ڕۆژنامەیەی -لاتریبیوون- و -لیبرتیە-دا هاتبوو كەدوو گۆڕی بەكۆمەڵی خەڵكی مەدەنی دۆزیبوووەو تێیدا خەڵك دەستە سەربازییەكانی پاراستنی ئاسایشیان مەحكوم دەكرد كەسەر بەهێزی ڕەسمی دەوڵەتن.

## ■ سۆماڵ

لەسۆماڵدا شەڕێكی كوێرانە بەڕێوە دەچێت ئەوەی چەكدارە نازانێت لەپێناوی چی چەكی هەڵگرتووە. ئەوەی دەشكوژرێت نازانێت لەپێناوی چی كوژراوە.. شانۆگەری شەڕی هۆزەكان شێوازی یەكیەتی ئەم وڵاتە موسوڵمانەی شێواندووە. لەو كاتەوە كەمحەمەد سیادبری ساڵی ١٩٩١ لەم وڵاتە لابردرا. خوێنی ڕژاوی موسوڵمانان لەو دەڤەرە وشك نەبووەتەوە سەرەڕای ئەوەی دەوڵەتە ئیسلامییەكان چەندین هەوڵی شەڕ وەستانی بۆ دەدەن. هێشتە كۆبوونەوەیەك تەواو نابێت و لایەنەكانی جێبەجێ ناكرێن كەچی لەلایەكی دیكەوە شەڕو پێكدادانی نێوان هۆزەكان دەست پێدەكاتەوەو بۆ جارێكی دی هێمن و ئاسایش تێكدەچێتەوە ئەو حاڵەتە سریالیەی گەلی سۆماڵ گەیشتووەتە نائومێدییەك خەریكە دەوڵەتە ئەوروپاییەكانیش لێیان بێزار بن. بەڵام لە وتەیەی دواییە - حوسێن عیدید- بۆ ڕۆژنامەی -ساندای تشن- كردی كەتێیدا گوتی (ڕۆژ بەدوای ڕۆژ خەڵك پتر پێویستیان بەئاشتی دەبێت و ئومێدەواریین هەموو خەڵكی سۆماڵ پێویستیان پێبێت).

## ■ نایجیریا

لەو وڵاتە موسوڵمانە گەورەیە كە لەسەر دەریای نەوتە خەڵك خەریكە لەبرسان پەلاماری داوودەزگەی حكومەت دەدەن شەڕو پێكدادان و توندوتیژی ڕوودەدات. نایجیریەكان لەتۆڵەی هەژاری و دەربەدەری خەریكن وەك شەڕی پارتیزانی پەلاماری بنكە ئازووقەییەكانی دەوڵەت بدەن. لەلایەكی دیكەوە كارگێڕە سەربازییە دیكتاتۆرەكان دەستیان بەسەر گشت سامانی گەلدا گرتووەو خۆیان پێی دەوڵەمەند كردووەو بانقەكانی ئەوروپایان پڕ دراوی بیانی كردووەو داهاتی نەتەوەییان بەگشتی تاودیو كردووە.

شایانی باسە لەم وڵاتە كۆمەڵە كۆمپانیایەكی نەوت و گاز دەستیان بەسەر كاروباری سیاسی و كارگێڕی نایجیریا گرتووەو كۆمپانیاكان وەك -شل-ی ئەمەریكی كاروباری خوێندن و بوژانەوەی ژێر خانی دەوڵەت و چاودێری تەندروستی بەدەست گرتووە. جەماوەری موسوڵمانی ئەو وڵاتەش لەمەدا بێزارن و لەبەر نەبوونی بواری دەربڕینی بیروڕا دەنگی گەل كپ كراوەتەوە.

## ■ بەریتانیا

### یاسایەكی بەریتانی موسوڵمانەكان لەدەستدرێژی ڕەگەزایەتی دەپارێزێت

ماوەیەك بەر لەئێستە ئەنجومەنی گشتی - پارلەمان-ی بەریتانی گفتوگۆی لەسەر مەسەلەیەكی گرنگ كرد كەتێیدا پرۆژەی یاسای تاوان و تێكڕای دارشت. لەپرۆژەی یاساكەدا مافی موسوڵمانەكان دەپارێزرێت كەپێشتر لەبەر باوەڕە ئاینییەكانیاوە تووشی گیروگرفتی ڕەگەزایەتی دەبوونەوە.

ئەم هەنگاوەی پارلەمانیش لەوەوە ئەنجام درا كە-جاك سترۆ-ی وەزیری ناوخۆی بەریتانی لەو دواییە لەگەڵ ڕێكخراوە ئیسلامییەكانی



...ریتانیا کۆبووەوە تێیدا بەئاشکرا ...مارژەی بەوە کرد کەموسوڵمانە ئینگلیزەکان لەبەریتانیا پێشتر تووشی دەستدرێژی رەگەزاییەتی دەبوونەوە. ئەمەش لەراستیدا دەستکەوتێکی گرنگی موسوڵمانە رۆژئاواییەکانە لەمەسەلەی پێشکەوتنی شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا

## ■ جنێف

### لەسەدا ٨٠ی پەناهەندەو رەوکەرانی دنیا موسوڵمانن

ئەمینداریەتی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لەبەیاننامەیەکی رۆژنامەگەریدا گوتی کێشەی پەناهەندەو رەوکەرانی دنیا گەلێک گەورە بووەو ئەگەرچی دەوڵەتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لەمبارەیەوە درێغیان نەکردووە. ئەوەی شایانی باسە لەبەیاننامە رۆژنامەگەریەکەدا هاتووە کەموسڵمانەکان لەسەدا ٨٠ی کۆی پەناهەندەو رەوکەرانی دنیا پێکدێنن کەدەگاتە ٢٣ ملیۆن کەس. بەمانای پتر لە١٧ ملیۆن موسوڵمان لەوڵاتانی خۆیان رایانکردووەو ناویان لەبنکە فریاگوزاریەکانی نێو دەوڵەتی تۆمار کراوە

## ■ ئیتالیا

### ٣ هەزار ئیسلامی ئیتاڵی تیرۆر مەحکوم دەکەن

راپۆرتە ئیسلامییەکان ئاماژەیان کرد کەپتر لە٣ هەزار موسوڵمانی ئیتاڵی سکاڵانامەیەکیان مۆرکردووەو تێیدا ئایینی ئیسلامییان لەو تاوانکارە تیرۆریستیەی کەبەناوی ئیسلام ئەنجام دەدرێت. بێبەری کردووە.

شایانی باسە کۆنگرەی موسوڵمانەکانی دانیشتووی ئیتاڵیا ...وایە لەو وڵاتە سازدراو تێیدا ...لەسەر مەسەلەی تیرۆرو توندوتیژی کرا... هەروا لەکۆنگرەکە ئەوە دووپاتکرایەوە کەئایینی ئیسلام لەسەر بنەمای لێبووردن دابڕێژراوەو لەو هەموو تاوان و توندوتیژییەی لەسەرانسەری دنیا دەکرێت. ئیسلام بێبەرییەو ئەمانەش بەگشتی ئەخشەو پیلانی دەزگە موخابەراتیە جیهانییەکانە کەتێیدا نیازیان وایە ئایینی ئیسلام بشێوێنن.

ئاشکرایە لەئیتاڵیا ٧٠٠ هەزار موسلمان هەیەو لەنێوان ٣٥٠ بنکەی ئیسلامی بڵاوبوونەتەوە.. هەرچەندە لەماددەی هەشتی دەستووری ئیتاڵی ...بەهاوتەبایی بیروباوەرە ئاینییەکان دەکات. کەچی تائێستە کاری پێنەکراوە. بەڵام موسوڵمانان هەوڵی ئەوە دەدەن لەنوێژی هەینیدا وتاری ئاینی هەبێت. دان بەهەردوو جەژنی رەمەزان و قوربان بنرێت موسوڵمانەکان مافی کردنەوەی قوتابخانە ئاینییەکانیان هەبێت. قازییەکی موسوڵمان لەلایەن حکومەتەوە دابمەزرێت بۆ مارەبڕین هەروا لەکۆتاییدا موسوڵمانەکانی ئیتاڵی هەوڵی ئەوەش دەدەن کەمافی دروستکردنی مزگەوتیان هەبێت.

## ■ UN

### لیژنەی ئەفەریقیا بۆ فریاگوزاری ئاوارەکان

خواردن و دەرمان بۆ ئاوارەکانی شەری ئەریتیریا- ئەسیوپیا بەبەردەوامی رەوانە دەکرێت

فەهد زەرمانی جێگری سەرۆکی نوسینگەی قوچی ئەفەریقی و ناوەراست و رۆژئاوای ئەفەریقیا لەلیژنەی ئەفەریقیا بۆ فریاگوزاری ئاوارەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی دراوسێ ئەریتیریا- ئەسیوپیا. گوتی ئەو ژمارە زۆرەی ئاوارەکان کەهەزارەها خێزان گوندو شاریان بەجێ هێشتووە ئەو خەڵکە راستە ئێستە تووشی ژیانێکی پڕ لەکولە مەرگی بوونەتەوە کە لەئەنجامی تۆپبارانی هەردوولادا ئەمانە ئاوارە بوونەتەوە کەچی لەراستیشدا ئەو خەڵکە پێش ئەو شەرە نەبوون بووینەو ناوچەکە زۆر هەژار بوود هەروا لەمبارەیەوە بەرێزی گوتی لیژنەی ئێمە هەوڵی ئەوە دەدات ئێش و ئازاری ئەو خەڵکە کەم بکاتەوەو خواردن و دەرمان و پێداویستیەکانی دیکەی ژیانی رۆژانەیان بۆ دابین بکات.

## ■ پاکستان

### پاکستان قسەکانی (زانای دادر) بەدرۆ دەخاتەوە

حکومەتی پاکستان بەتوندی بەرپەرچی ئەو قسەو قسەلۆکانەی دایەوە کەکابرایەک بەناوی - ئیفتیخار خان تشودری- دەڵێت





گوایە کەئەو زانای ئەتۆمەو لەگەڵ چوار زانای پاکستانی دیکە بۆ ئەمەریکا هەڵاتوون. ئەمەش لەدوای ئەو کۆبوونەوەیە بووە کەتێیدا بڕیار دراوە (بەچەکی ئەتۆم لەشاری نیودلهی پایتەختی هیندستان) ئەتاقیگە لیکۆڵینەوەییە ئەتۆمییەکانی هیند بدرێت. هەواڵەکان وا رادەگەیەنن کەتشودری ئەکەنداوە بۆ ئەمەریکا چووە. ئەوێش گوتوویەتی ئەگەر ژیانم بپارێزن گشت زانیاریەکانی لەمەڕ چەکی ئەتۆمی پاکستانیان بۆ ئاشکرا بکات.

جەوهەر ئەیوب خانی وەزیری دەرەوەی پاکستانیش لەمبارەیەوە گوتی تشودری کابرایەکی درۆزن و فێلبازە. دەزگە موخابەراتییەکان ئەمەیان دروست کردووەو ئەخشەی ئەم درۆو دەلەسەیان بۆ دارشتووە. بەڵام ئەیوب خان ئەو دەزگە موخابەراتیەی دەستنیشان نەکرد کەئەو مەسەلەیان هەڵبەستووە.

## ■ ئەسیوبیا - ئیسرائیل

### -فلاشا-ی ئەسیوبیا گەیشتنە ئیسرائیل..

لەسەرچاوە ئەفەریقیەکان زانراوە کەحکومەتی ئەسیوبیاو ئیسرائیل رێککەوتنامەیان مۆر کردووە تا ٣ هەزار -فلاشا- جوولەکەی ئەسیوبیا بگوێزنەوە ئیسرائیل.

سەرچاوەکان دووپاتیان کردەوە کەنزیکەی هەزار جوولەکەی ئەسیوبیا لەو ..و مانگەی پێشتر گەیشتوونەتە ئیسرائیل و لەوێ لەنیشتەجێگەکانی قودس و دەوروبەریدا نیشتەجێ کراون. هەروا سەرچاوەکان ئەوەشیان ئاشکرا کرد کەئیسرائیل بەڵێنی بەئەسیوبیا داوە لەململانێی دژ بەئەریتریا یارمەتی بدات.

لەلایەکی دیکەوە سەرچاوە دیبلۆماسیە ئەفەریقیەکان حکومەتی ئەسیوبیایان تاوانبار کردووە کەچەند بنکەیەکی لەناوچەی قۆچی ئەفەریقی بەئیسرائیل داوە تا لەو ناوچەیە سیخوڕی لەسەر میسرو دەوڵەتە کەنداویەکان بکات.

## ■ تورکیا

### یەڵماز لەبارە ئوسوڵیەکان ددان بەتەنگوچەڵەمەی حکومەتەکەی دەنێت

مەسعود یەلمازی سەرۆک وەزیرانی تورکی ددانی بەو تەنگوچەڵەمەیەی حکومەتەکەی هێنا کەلەنێوان حکومەتەکەی و سوپادا روویداوە ئەمەش لەوەدا هاتووە



کەسوپا بەشێوازێکی دیکە چارەی ڕەوتی ئوسوڵیەکان دەکات.

یەڵماز لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەگەریدا گوتی ئێمە لەگەڵ سوپا گیروگرفتی گەورەمان هەیەو هەر لایەنێک لەئێمە بەشێوەیەکی جیا سەیری چارەسەری ڕەوتی ئوسوڵیەکان دەکات ئێمە دەمانەوێت بەشێوەی یاساو لەچوارچێوەی بنەماکانی دیموکراتی و دەوڵەتی یاسا رەفتار لەگەڵ ئوسوڵیەکان بکەین بەشێوەیەک دوور لەتوندوتیژ سەنگەریان پێبەر بدەین. کەچی سیاسەتی سوپا ئەوەیە دەیانەوێت توندتر رووبەڕووی ئوسوڵیەکان ببنەوە.

لەلایەکی دیکەوە جەنەراڵ شەفیق بیر-ی بەرپرسی سەرەکی گوتی (ئوسوڵیەکان هێشتە ماون و گەورەترین هێزی وڵاتن) لەمەشدا مەبەستی فەزیلە-ی حیزبی ئیسلامی نوێ بووەو مشتومڕێکی گەورە لەنێوەندە سیاسیەکە خولقاندووە.

## ■ بەنگلادیش

### پەناهەندە رۆهنجیاییەکان لەترسی کوشتن نایانەوێت بگەڕێنەوە

٢٥ هەزار پەناهەندەی موسوڵمانە رۆهنجیاییەکانی ناوچەی کۆکس لەبەنگلادیش لەترسی کوشتن و سیاسەتی خاوێنکردنەوەی رەگەز نایانەوێت بگەڕێنەوە هەرێمی ئەراکانی بۆرمی کەهێزە بۆرمیە بت پەرستەکان لەبەرچاوی دەسەڵاتدارە سیاسییەکان موسوڵمانانی ئەو

هەرێمە ئازار دەدەن و دەریان دەکەن. ئەگەر بەرپەرچی ئەو سیاسەتەش بدەنەوە ئەوا بێ گومان دەکوژرێن. لەژێر چاودێری بەشی کاروباری پەنابەرانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان کاروانێک لەو پەناهەندانە گەڕاونەتەوە هەرێمەکەی خۆیان بەڵام هێشتا ترسی ئەوەیان هەیە ئەلایەن جێ بودیە سەربازەکان ئازار بدرێن لەمبارەیەوە حکومەتی بەنگلادیش هەوڵ دەدات کێشەی پەناهەندە ڕوهنجیاییەکان لەگەڵ حکومەتی بورما چارە بکات کەلەودیوی سنووری نێو بورمادا دەژین لەلایەکی دیکەوە سەرکردەکانی ئەراکان داوای ئوتونومی دەکەن و بۆ ئەمەش حکومەتی بەنگلادیش پشتگیریان لێ دەکات لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵی ئەوە دەدەن پشتگیری دەوڵەتە ئیسلامییەکانیش پەیدا بکەن. دامەزراوگەو کۆمەڵەو لێژنە خێرخوازە ئیسلامییەکانی ئیستە یارمەتی فریاگوزاری پێشکەش بە ٢٢٩ هەزار پەناهەندەی ئەو دەڤەرە دەکەن کەلەباروودۆخێکی تەندروستی زۆر خراپ و لەژیانێکی پڕ مەترسیدا دەژین

## ■ تورکیا ئیسرائیل

### چەند فڕۆکە شەڕکەری تورکی گەیشتنە ئیسرائیل

دەستەیەک لەفڕۆکە شەڕکەری تورکی جۆری - (ئێف-٥) گەیشتنە یەکێک لەبنکەکانی هێزی ئاسمانی ئیسرائیل.

لەم بارەیەوە ئێزگەی ئیسرائیل گوتی ئەو فڕۆکانە لەپێشانگای ئاسمانی نێو دەوڵەتی بەشداری دەکەن کەبەبۆنەی یادی پەنجا ... ی دامەزراندنی ... ی ئاسمانی ... ساڵ دەکرێت ... شکراشە ... ئیسرائیل و تورکیا پەیمانی ... کاری ئاسایشی هاوبەشیان ... کردووە و بەگوێرەی ئەم ... پەیمانەش فڕۆکەی هەردوو لایەن ... دەتوانن لەئاسمانی وڵاتی یەکدی ... هەروا ئێزگەی ئیسرائیل ... شی گوت کەفڕۆکەو ... فڕۆکەوانەکانی هەموو دنیا ... لەپێشەنگایە بەشداری دەکەن.

## ■ میسر

### ئەزهەر و بنکەکانی شێواندنی ئیسلام لەئەنتەرنێت

ئەحمەد عومەر هاشمی سەرۆکی ... انکۆی ئەزهەر ئاشکرای کرد کە ئیازی وایە لەدژی تۆڕی ... ئەنتەرنێت داوایەک بەرز بکاتەوە. کەئەم تۆڕانەی ئەنتەرنێت سوورەتی قورئانی پیرۆز دەشێوێنن.

هاشم بەدەزگەی -فرانس بریس-ی ڕاگەیاند کەیاداشتنامەیەکی بۆ کۆمەڵەی لێکۆڵینەوەکانی ئیسلامی سەر بەزانکۆی ئەزهەر بەرزکردووەتەوە، تییدا لێکۆڵینەوەی لەمەڕ ڕێگەی باسایی کردووە کەبەچ شێوەیەک داواکەی خۆی لەدژی کۆمپانیای ئەمەریکان ئۆن لان- پێشکەش بکات کەئەو کۆمپانیایە سەرچاوەی گشت زانیارییەکانی تۆڕی ئەنتەرنێتن.

لەدرێژەی یاداشتنامەکەیدا هاشم دەڵێت زۆر تۆر هەیە کەلەئەنتەرنێت دەقی قورئانی پیرۆز بەشێوازی بڵاودەکەنەوە لەمەشدا نیازیان شێواندنی ئاینی ئیسلامە

لەم دواییەش ڕۆژنامەی ... زی ئیجیبشان گازێت-ی میسری وتارێکی دوورو درێژی بڵاوکردەوە تییدا کۆمپانیای ... ی ئۆ ئێل ... ی تاوانبار کرد کەزانیاری شێواز بڵاودەکاتەوە و لەمەشدا نیازی وایە ئیسلام بشێوێنێت

## ■ پاکستان

### دەوڵەتە ئیسلامیەکان پشتگیری لەسەربەخۆیی گەلی کەشمیر دەکەن

بالێوزی دەوڵەتە ئیسلامیەکان لە-ئیسلام ئاباد- پشتگیری تەواوی خۆیان بۆ سەربەخۆیی گەلی کەشمیر دووپات کردەوە شایانی باسە سەرۆک وەزیرانی کەشمیری سەربەخۆ لەو بەیەککەیشتنە وتارێکی بەپێزی خوێندەوەو تییدا باروودۆخی ئیسلامەکانی دەڤەری کەشمیری ڕوون کردەوە.

لەمەشدا بالێوزی ئێران - سوریا- سعودیە- فەلەستین- تورکمانستان- ئازەربێجان - کازاخستان - تورکیا - ئەرەدەن - تونس- جەزایرو لوبنان ئامادەبوون. هەروا لەدرێژەی وتارەکەیدا ڕووداوەکانی دەڤەری کەشمیری ڕوون کردەوە کەهێزەکانی هیندی ڕۆژانە چۆن تەقە لەخەڵکی مەدەنی موسوڵمانی کەشمیری دەکەن.

یەکەم بانگی ئازادیو رەحمەتی بەدەنگی زولالی بیلالی حەبەشە دەستی پێکردو تا ئەمرۆش وەکو شانازی هاوەڵێکی موسڵمان ماوەتەوە. هەربۆیەش پێغەمبەر (ﷺ) لێبێت لەسەر وەفاتی خۆی لەم شارە خۆشەویستو شیرینەدا نێژرا لەساڵی (١٢)ك.

**شاری مەدینە:**

ئەم شارە لەرووی ستراتیژییەوە چی کەمتر نییە لەشارەکانی (ریاض)و (جدده)و دەکەوێتە ناوەراستی رووباری (شاسع)و بەرووی باشووریشیەوە زەویەکەی ٩١٦مەتر لەئاستی رووی دەریا بەرزترەو لەلایەکی تریشەوە بەکێڵگە داپۆشراوە.

رادەی شێو پلەی گەرمی شاری (مەدینەی منەوەرە) بەرزە بەڵام لەکاتی ئاساییدا بەپێوانە لە ٢٨ پلە تێناپەرێو لەوەرزی زستانیشدا نزم دەبێتەوە تادەگاتە ١٠ پلەی گەرمی لەرۆژداو ٥ پلە لە شەودا،تائێستاش خەڵکی شاری مەدینە بەم ئاوو هەوایەوە سەندەو بەختەوەرن ژیانێکی ئاسوودەی لەگەڵ بەسەر دەبەن، جگە لەچەندین جۆری میوە دەوەرزکاندا.

شاری مەدینە جگە لەشەقامە سەرەکییەکانی چەندین گەرەکی جوانو گەورەو جیا جیای تێدایە کە ئەوانەش پەیوەستن بەزیندوویی ئەم شارەو گەرەکەکانیش وەکو (الخیاطین)و (البدور)و هەروەها گەرەکی (مالم بن انس)و گەرەکی (الحجامین).

سەرەرای ئەمانەش لەگەڵ چەندین بازاردایەك دەگرنەوە وەك بازاری تایبەتی دیاری حاجییەکانی هەندێکی تری تایبەت بەحەسانەوە ئەمانەش لەکاتی حەجدا بۆ حاجییەکان لەو شارەدا.

لەرووی کێڵگەشەوە ئەوا رووبەرێکی فراوانی هەیە (دار خورما) کە بەپلەی سەرەکی دەژمێردرێت بەدەورو بەری ئەم شارە بڵاو بونەتەوەو دابەش کراون بۆ چەند کێڵگەیەك، لەوانە بچوکیان پێك هێناوەو گەورە کێڵگە خورماییەکانی شاری (مەدینە) کە لەدەورووبەریەتی لەتەنیشتیانەوە کانیو ئاوی سازگاری لێ هەڵدە قوڵێو پێاندا دێتە خوارێ چەندین شەپۆلی بەم لاو بەلاودا بڵاو کردۆتەوە کە سودی بەکێڵگە بچوکەکانیش داون.

گرنگترین کانییەکانی ئەم شارە بریتییە لە (تیماء)و (دومە الجندل)و (ذو الرمە)و(وادی القری)و (مدین)و (فدك)و هەروەها پێك هاتەی (واحات الثرة)ن کەئەمانەش لەناوەراستی بیابانەوە دیارن،ولەلایەکی ترەوە بیرە پیرۆزەکانیش کە تائێستا ناوبانگو ناسراون خەڵکەکە لەبەرر پیرۆزیان سەردانی دەکەن وەکو بیری (انس بن مالك) وبیری (رومە)یەو لەبەرامبەریشیان بیری (الاعوام) هەیە روو بەرووی بەشەکانی تری ئاو دەبنەوە لە (عین الزرقاء) لەتەنیشت مزگەوتی (قباء).

سەرەرای گرنگترین ئەمانەش گەرەکی یادگاریو خۆشەویستیو پر لەسەروەری (دار الکریمە) هەیە، کە دیارترینو چاکترین نیشانەی ئەو شارەیە شاری (المدینە المنورە) کەمزگەوتی پێغەمبەری خودای گەورەی تێدایەوو مزگەوتەکە لە (٥) دەرگا پێك هاتووە وەك لەباکورییەوە دەرگای (سەلام)و (رەحمە)و (المجیدی) هەیەو لەلای رۆژ هەڵاتیشیەوە دەرگاکانی (نساء)و (بقیع)ی کۆن هەن.

هەریەکی لەگرنگترین شوێنەکانی ئەم شارە پیرۆزە گۆرستانی (البقیع)ەکە جێگای هەزاران هاوەڵو دۆستی پێغەمبەرو موسڵمانانی تێدایە لەوانەش دەستە راستی پێغەمبەری خۆشەویست لەشەردا (هەمزەی) مامی پێغەمبەرونەم گۆرستانە زیاتر لە لای بنکەی سەرەکی شارەکەوە نزیکە.





# ئەوقاف لەنێوان کۆن و نوێدا

ئامادەکردنی: جمال ئەحمەد عەبدوللا

بیرۆکەی وەقف لەروانگەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزدا هەژمار دەکرێت لەبابەتی (الصدقات)پاش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە (لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون) لەلایەن زانایانی شەریعەتی ئاینی ئیسلام.

سەرەرای فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)(اذا مات ابن ادم إنقطع عمله الامن ثلاث صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعوله)...

وەقف بەندکردنی ماڵ و موڵکە بەمەبەستی خێرو چاکە بەبەردەوامی بۆ خاوەن بەندکراوەکە (الواقف) وەپاداشت دانەوەی لەرۆژی (القيامه) وەلە بنەرەتدا وەقف نابێت بفرۆشرێت یان میراتی لێ بگیرێت یاخود (هبه) بکرێت.

ئەوقافی ئیسلامی بەهۆکاری سەرەکی وبە گرنگترین پاڵپشت دادەنرێت بۆ مانەوەو خزمەت کردنی زاناو قوتابی. قوتابخانەکانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز وەدیارترین بەڵگەش ئەوقافی ئەزهەری شەریفە لەمیسر وەلەکوردستانی دێرینیشماندا قوتابخانەکانی سەر بەمزگەوت و تەکیەکان شایەتیمان بۆ دەدەن لەم بوارەدا سەبارەت بەیەکەمین وەقف لەئیسلامدا موسڵمانان دوو رایان هەیە:-

یەکەم:- وەقفی پێغەمبەر (ﷺ) بەدروست کردنی مزگەوتی (القباء) لەشاری مەدینە (یثرب) پاش گەیشتنی بۆ ئەم شارە پیرۆزە لەئەنجامی ئەشکەنجەو ئازاردانی لەلایەن کافرەکانی شاری مەکە وەکۆچ کردنی بەناچاری هەروەها دروست کردنی مزگەوتی (النبوی) لە هەمان شارداو وەقفی (سبع حوائط) لەشاری مەدینە بۆ هەژاران و لێ قەوماوانی بنەماڵەی هاشمی و عبدالمطلب بەیەکەم وەقف دەدانێن.

دووەم:- وەقفی خەلیفەی راشیدی عومەری کوری خەتتاب خوا لێی رازی بێت بەیەکەم وەقف دادەنێن.

ئینجا وەقفی هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) یەک لەدوای یەک لەوولاَتانی ئیسلام وەک عوسمان کوری عەفان و علی کوری أبی طالب و سعدی کوری وقاص و عمرو بن عاص وە زۆر لەم وەقفانە هەتاوەکو ئێستا ماون و لەخزمەت کردنی ئاینی ئیسلامدانە، وەلەسەردەمی خەلافەتی ئەمەویەکان ئەوقافەکان لەپەرەسەندن دابوون و موسڵمانان لەسەر سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام ماڵ و موڵکی خۆیان وەقف کردووەو بۆ یەکەم جار ئەو قافەکان خرانەژێر دەستی قازیەکان و ئەوقاف دیوانێکی بۆ دامەزرێنرا بەناوی دیوانی ئەوقاف بەمەبەستی تۆمار کردنی وەقفەکان و لێپرسینەوەی متولیەکان بەتایبەتی لەسەردەمی خەلافەتی عومەری کوری عبدالعزیز.

وە لەسەردەمی خەلافەتی عەباسیەکان بۆ زیاتر کۆنترۆل کردنی و پارێزگاری ئەوقافەکان ئەوقاف سەرۆکی بۆ دانرا بەناوی (صدر الوقوف) بۆ چاودێری ئەوقافەکان ژێر



دەستی متولیەکانو بەڕێوەبردنی ئەوقافە (مضبوطە)کانو وەچارەسەرکردنی گیرو گرفتەکانی ئەوقافەکان.

یەکەم پێکهێنەری بەڕێوەبردن بەشێوەیەکی رەسمی سەری هەڵدا لەسەر دەستی سوڵتانە عوسمانیەکان بە (تشریع) کردنی یاساو نیزامی تایبەت پاڵپشت بەئەحکامی شەریعەتی ئیسلام وەشوێنەواری ئەم یاساو نیزامانە تاوەکو ئێستا بەدی دەکرێت لەیاساو نیزامی ئەوقاف لەکاتی ئێستا وەپاش وەرگرتنی دەوڵەتان موسڵمانی ژێر دەستی خەلافەتی عوسمانی زۆربەی دەوڵەتانی بەمەبەستی بەڕێوەبردنی ئەوقاف وەرێز گرتن لەوەقف وەزارەتی ئەوقافیان بۆ دامەزێنرا یاخود سەرۆکایەتی دیوانی ئەوقاف وەلە عێراق وەزارەتی ئەوقافیان دامەزراندو یاسای ژمارە (٢٧) لەساڵی ١٩٢٩ بۆ (تشریع) کراو ئەرکی جێ بەجێ کردنی ئەم یاسایە کەوتە ئەستۆی وەزارەتی ئەوقاف وەیاسای کار پێکراوی ئێستا ژمارە (٦٤) ساڵی ١٩٦٦ راستکراوە سەرەڕای ئەحکامی شەریعەتی ئیسلام، بەڕێوەبردنی ئەوقاف لەنێوان وەزارەتو سەرۆکایەتی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئەوقاف ماوەتەوە وەلە گەڵ دروست بوونی یەکەم کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق لە ٤ ١٩٩٢/٧ پاش راپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ بەڕێوەبردنی وەقف سپێردرا بەوەزارەتی ئەوقافو کاروباری ئیسلامی بۆ رێزگرتنو خزمەتکردنی ئایینی ئیسلامی پیرۆزو بوونی ئەوقاف لەزۆربەی گوندو شارەکانی هەرێمداو بەردەوام بوونی موسڵمانانی کورد بەوەقف کردنی ماڵو موڵکی خۆیانو بەڵگەشمان مزگەوتو تەیکەو گۆڕستانو بەندکراوەکانی ترە لەکوردستاندا.

بەگشتی دەتوانین ئەوقافەکان بکەین بەدوو بەش:-

یەکەم:- ئەوقاف ئایینیەکان وەك مزگەوتو تکیەو گۆڕستان شوێنە ئایینەکانی تر.

دووەم:- دامەزراوە خەیرییەکان وەك خانوو زەویو دوکانو باڵەخانەو...هتد. کەوەقف کراون لەسەر ئەوقافە ئایینەکان یاخود بۆ هەژارانی موسڵمانان.

میللەتانی پێش ئیسلام هەمان شت ماڵو موڵکی خۆیان وەقف کردووە بەڵام جیاواز لەمەبەستو شێوەی کە وا ئایینی ئیسلامی ئاماژەی پێ کردووەو ئەحکامی تایبەتی بۆ داناوە. وەك یۆنانیەکانو رۆمانیەکانو میسرییەکۆنەکانو هەڵسانیان بەوەقف کردنی بەنرخترینو بەهاترین موڵكو ماڵیان لەسەر گۆڕستانو پەرستگاکانیان وەئەوقافی ئیبراهیم (الخلیل) دیارترین بەڵگەیە بەردوست کردنی کەعبەی پیرۆز کەوا تاوەکو ئێستا ماوەو پیرۆزە لای هەموو موسڵمانان دوا ووتەمان بۆ موسڵمانانی بەڕێز فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) (من سن سنة حسنة فله أجرها وأجر من عمل بها الى يوم القيامة، ومن سن سنة سيئه فله وزرها ووزرمن عمل بها من غير أن ينقص منها شيء الى يوم القيامة).

## سەرچاوە


١- مصطفى مجيد. شرح قانون التسجيل العقاري رقم ٤٣ساڵی ١٩٧١ج ١- بغداد طبعة ١٩٧٣.

٢- العاني. محمد شفيق. احكام الاوقاف طبعة ١٩٥٥ بغداد.

٣- الكبيسي،د. محمد عبيد،احكام الوقف في التشريعة الاسلامية بغداد ١٩٧٧.

٤- المحامي/ عبدالرزاق هوبي محمد- التشريعات في ادارة الاوقاف بغداد ١٩٨٩





# مێژووی شاری کۆیەو مەلاو زانا بەناوبانگەکانی

دلێر عەونی

ئەگەر لاپەڕەی مێژوو بەسەرهاتی ڕۆژگار هەڵدەینەوە ئەوا زۆر کەس هەن چرای ژیانیان سوتا لەپێناوی ڕێبازو چارەسەر کردنی دەردی کۆمەلایەتی، شەونخونی و تاڵ و سوێریان چەشتوەو کونە ئەشکەوت و شاخ و داخی کوردستانیان بەقەسرو تەلار ئەگۆڕیوەتەوەو لەپێناوی ئازاد بوونی گەل لەکۆت و زنجیرەی دەردی کۆمەڵایەتی. دەبێ ئێمەی کورد شانازی بەوە بکەین کەمێژوو سەرفیرازی بۆ تۆمار کردوین یا ئەوانەی وەکو سەربازی ونن بۆ ئەوەی لەگۆشەی مێژوو دانەبڕێن شاری کۆیە هەر لەکۆنەوە بەشاری عیلم و ئەدەب و تەرەب ناسراوە چەندین مێژوونووسە گەڕۆکەکان ئەوەی بەکۆیەو دەوروبەری دارەت بووە ئەوا لەسەر کۆیەی نوسیوە وەکو لیفتناند ولیە هودو کابتان ف- ئار مونیل و م کلیمنت و ئەدموندز زۆر لەمێژونووسانی تر.

کۆیە خاوەنی گەڵێ مامۆستای ئایینی بەناوبانگ و ڕەوشەنبیرو



مەلا محەمەدی

بو بەدڵ و گیان خزمەتی ئایینی ئیسلامیان کردوە هەر مزگەوتێك خۆی لەخۆیدا قوتابخانەیەك و سوختەخانەیەك بووە چەندین مامۆستاو مەلای ئاییینی شۆڕشگێر لەو شارە سەری هەڵداوەو پێگەیشتووە چەندین مەلا لەکوردستانی ئێرانەوە هاتونەتە کۆیە لەسەردەستی مەلاکانی کۆیە ئیجازەی مەلایەتیان وەرگرتووە. چەندین کتێب و دەست نووس یان بۆ بەجێ هێشتووین، هەر هەموویان لەگەڵ بیروڕایەکی پتەوی نەتەوە پەرستیش بوونە هەرگیز لەگەڵ ئەوانە نەبونەو کەسەریان لەمیللەت شێواندوە ئەوانەی کەنامەی خوێندەواری و هەموو چەشنە بیروڕایەکی پێشکەوتن بوونە. یەکەم کەس بوونە کەمنداڵی خۆیان فێرە خوێندنەوەو نووسین بوونە بەکوڕو کچەوە گوێیان نەداوتە قسەو قسەلۆك ناردویانە بۆ قوتابخانە نەیانتوانیوە چاوپۆشی لەدیاردە نارێکەکانی کۆمەڵ بکەن بەڵکو قوڵی خۆیان لێ هەڵمالیوە هاتونەتە نێو خەبات و تێکۆشانی سەخت لەپێناو هوشیار کردنەوەو





ئازادبوونی کۆمەڵ لەدیاردەی سەلبی و گیانی خۆیان هاویشتۆتە مەترسیەوە چونکە بەرژەوەندی میللەتیان لەڕێگای ئایینەوە لەهەموو شتی لەلا پیرۆزتر بوو. چەند جوان و دڵخۆشکەرە مامۆستای ئایین پەنجە بۆ دیاردە نارێکەکانی کۆمەڵ درێژ بکاو تاریکی شەوە زەنگ بەچرای پڕ زانیاری رەوشەن بکاتەوەو لەڕێگای خواپەرستی و ئایینەوە هەستی نەتەوایەتی بجولێنن جگەر سوزانە پەرۆشی میللەتەکەیان بن چونکە شۆڕشەکانی کورد لەسەر دەستی پیاوانی ئایین خواناس دروست بووە هەر لەشێخ محمودی نەمرو شێخ سعیدی پیران و قازی محمدو مەلا مستەفای بارزانی نەمر.

لەکۆیە پێشتر خوێندن لەسوختەو مزگەوتەکان بوو ئەو مەلایەی دەرسی بەسوختە دەدات فارسی باش زانیوە، چەندین بنەماڵە هەبوون سوختەیان لەماڵی خۆیان دانابوو، لەهەموو مزگەوتەکانی کۆیە دەرس دەخوێندرا. زیاتر لە ٥٠٠ فەقێ هەبو هەر هەمووی خواردن و نووستنی بۆ دابین دەکرا، زۆر ماڵ هەن منداڵیان لەسوختە خوێندویەتی ئێستاکە مەلای ناوبانگ دەرچووەو خاوەن



مەلا سادق مەلا ئەحمەد

کتێبخانەو دەست نووسی کۆن و نایابن بەڵام داخی گرانم شەڕەکانی سەفەو عوسمانلی و شەڕەکانی یەکەم و دوهەمی جیهان بەسەدان و هەزاران دەسنووسی نایاب لەناوچوون.

هەموو ئێواران فەقێیەك یان قوتابیەکی سوختە لەدەرگای ماڵانی دەدا دەیوت (راتب رحمەتوڵبی) وەیا رۆژانی هەینی دەیوت جومعانەی فەقێیان بچنە بەهەشتێ).

جاران لەکوردستان بەگشتی و کۆیە بەتایبەتی لەکاتی ئیجازە وەرگرتنی فەقێ و قوتابی ئایینی شەش حەفت رۆژ لەسەریەك دەکرا بەشایی و زەماوەند گەلێ کۆڕو کۆبوونەوەی پڕ جۆش و خرۆش و هەمەچەشنە یاری گاڵتەو بەزم و سەیرانی تێدا دەکراو لەلایەن خەڵکیشەوە باروو پیتاکیان بۆ دەکرا. لەهەموو لایەکی کوردستان فەقێ و قوتابی ئایینی رویان لەشاری کۆیە کردوەو دەرسیان لای مەلاکانی کۆیە خوێندوە گەلێ مەلای ناودارو زانای پایەبەرز لەسەر دەستی ئەو مەلایانە پێگەیشتوون یەکێك لەو مەلا ناودارو زانای پایەبەرزانە مامۆستا مەلا فەتحولای هەرتەل کەلەسەر دەستی مەلا محمدی جەلی زادە ئیجازەی زانستیان لێ



مەلا قادر کانی

وەرگرتوە کەزانایەکی بەتوانا بووە لەهەموو خۆشناوەتی و ناوچەی رانیە تاکە مەلای بڕوا پێکراوو بەناوبانگ بوو.

### سەرچاوەکان:

بۆ ئەم باسە سودم لەکتێبی:
یەکەم: مەلای گەورە/ بەسەرهات و ژیانی عبدالخالق علاء الدین.
دووەم: مێژووی کۆیە- تایەر ئەحمەد.





# ئەو مزگەوتەی لەژێر خاکا دۆزرابووەوە!!

## ناوی (بارزان)

**عبدالخالق سەرسام ملاعزیز**

**بیرەوەریم لەگەڵ ئەم مزگەوتە دەگەڕێتەوە سالآنی ١٩٥٩-١٩٦٨ کاتێ باوکم مەلای مزگەوتی (بلەی بارزان) بوو باوکم ناوە ناوە دەچووە دیوەخانە بۆ حزووری رەحمەتی شێخ ئەحمەدی گەورە، شێخ مرۆڤێکی بەهەیبەت و بێ دەنگ و لەسەرخۆ بوو، جل وبەرگی سپی و خاوێن تیشکێکی پیرۆزی دەدایە مەجلسەکە، هەستم بەوە دەکرد رێزێکی تایبەتی باوکم دەگرێ کاتێ لەتەك خۆی دای دەنا... کەوێکی سپیان هەبوو سەرنجی رادەکێشام..**

زۆر مزگەوتم دی بوو لەکوردستان وەکو کوڕە مەلایێك بەلآم مزگەوتی سەیری وەك مزگەوتی بارزانم قەت نەدی بوو لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلول ئەم مزگەوتە دێرینەش کەوتە ژێر شاڵاوی دڕندانەو بۆمبابارانکرا.. بەم منالیە هەستم بەنرخێکی مێژوویی و ئاینی ئەم مزگەوتە دەکرد بەتایبەتی کەمنیش وەك خەڵکانی ناوچەکە ئەم سەربردەیەم دەزانی کەدەیان گوت جارێك لەجاران بارزانییێك چۆلەکەیێك دەبینێ لە لەکەلەنە بەردێك دێتە دەرەوە خۆی رادەهەژێنێ ئاو لەپەرەکانی دادەتکێ.. خەلکەکە زۆریان پێ سەیر دەبێ وە لەبەر پێویستی بۆ ئاو بەتایبەتی بۆ ئاوەدانی رەزکانیا شوێنەکە هەڵدەکۆلن لەدوای ئاوەکەدا لەپڕ دەگەنە خانووبەرەیێکی دوو نهۆمی و چەندین ژوورو ئەو دوو ژوورەی کەتەنیا کانیاوەکەیە) وەك بەبیرم دێ لەدوای سالآنی ١٩٦٣ بوو دەست بەچاك کردنەوەی مزگەوتەکە کراوە. لەکوردستانی تورکیا وەستای تایبەتیان هێنابوو بۆ ئەوەی لەسەر هەمان شێوە چاکی بکەنەوە.. تەنانەت هەلەیان لەبەردێکیش نەدەکرد، چوومە دیاری شێخەکان خۆیان سەرپەرشتیان دەکرد، منیش تاکە منالێك بووم لەنێویانا دەیان دواندم. پێیان دەوتم (کوڕ مەلا). ئەوەبوو لەسالی ١٩٦٥ لەبەرئەوەی کامیرام نەبوو یا هەر لەکامیرای سەندوقی تەك سەرای هەولێر نەمدەزانی کامیرای تر هەبێ وێنەی ژوورەکان و دەورەم بەدەست کێشا.. بەگوێرەی دەسەلآتی ئەوکاتەم لەدەفتەرێکی بیرەوری بچوك کەتائێستا پارێزراوە. نیشانی برادەرەکانمی بدەم لەهەولێر.

ساڵ وەرسوڕاو خولیای زۆر بابەتی مێژوویی بووم بەلآم لەو رۆژنامەو لەگۆڤار مەحروم بووین ئەم شتانەی لێ بلآوبکەینەوە. بارودۆخیش نالەبار. تا ئەم سالآنە نەبێ بارودۆخ یارمەتی زۆر شتی دام، کەبتوانم سەر لەبارزان بدەمەوە هەر تەنیا بۆ ئەوەی وێنەی مزگەوتەکە بەکامیرا بگرمەوە هیوای چەندین ساڵەم بێتەدی.

### مزگەوتە مێژووییەکەی بارزان

لەتەلانە شاخێکی لێژایی شارۆچکەی بارزانی دێرین کەدەکەوێتە بنار چیای شیرین مزگەوتێکە کە لەنزیکەی ١٥ ژووری بچوك و گەورە پێك دێت دوو ژوور لەو ژوورانە کەلەتەك یەکن بەبەرینایی هەردوو ژوورەکە ئاو لەژوورەکە هەڵدەقولێ، وەك دوو (کانی)ی گەورە لەیەك سەرچاوە، دیوارەکانی هەموو لەبەردی کلسی یا حەلان دروست کراوە، سەرووی بەبەردو قسڵ لەشێوەی چاتی قەیسەری داڕێژرابوو.





لەژووری کانیاوەکەوە بۆ ژوورەکانی یەك لەدوای یەك دەرگاو پێپلکەیێکی حەوك بەیەکتریان دەبەستیتەوە دەتوانی لەهەموو ژوورەکانو دوو ژووری کانیەکەش هاتوچۆ بکەیت بێ ئەوەی بێیتە دەرەوە تاکو بێبلیکە لەژوورەوەش. بۆ ژووری سەروو هەیە وەك خانوییکی شارستانی هاوچەرخ.

کەدەچێتە مزگەوتەکە هەست دەکەی لەرۆژگارێك و سەردەمێکی تری هەی ئەم سەردەمە نییە. وەك لەنەخشەکەی کاك (پێی ڕەش)دا هاتووە (ئاقدی بەری خڕ) سەکۆییکی خڕ هەبووە کەمرۆڤ بیر لەوە دەکاتەوە کاتی خۆی ئاتەشگاییکی زەردەشتی بووبێ یان (ژووری ئاقدی ئاگرێ) کرابێتە مزگەوت یان گۆڕانکاری تێدا کرابێ بەلام کاتێ (پیرەش) لەکتابەکەی باسی ئەوە دەکا کە(ئایەت) لەدیوارەکەی نووسرابێتەوە، ئەوا مرۆڤ لەم خەیالە دوور دەخاتەوە. کە لەمنالی من بەسەریا رانەشکاوم بیخوێنمەوە. بەهەرحال من زۆر بیناو خانووی بەرەی ئەورووپاو ئاسیام دیتووە، بەلام ئەمیان هەر سیحرو سەرسامی تایبەتی خۆی لەلاما مایەوە.




ئەم نەخشەیە لەکتێبی تاريخ العراق الحديث وەرم گرتووە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی.. لەنووسینی: د.عبدالعزيز سليمان نوار الچلبی، قاهیرە، کەلەکوتایی حوکمی داود پاشاوە دەست پێ‌دەکات تا مدحت پاشا.

بارودۆخی شۆڕش و ئەنفال و داگیرکەران زۆر پرسیاریان بێ وەلام هێشتەوەو زۆر وەلامیشیان خنکاند. بەتایبەتی لەم مەسەلەیە کەئەمە یەکەم شوێنەوارو لێکۆڵینەوەی مێژوویەم بوو لەسەرەهەڵدانی هۆشی ئاشنایم بەشوێنەوار کە لەسەرەتای گەنجیمدا بەچەند وێنەیێك تۆمارم کردبوو.. کەپاشان خولیای میتۆلۆژیای زەردەشتی سەرەتای ئێستام بوو شوێنی زێدی باپیرانی سەلاحەدین بدۆزمەوە. بۆیی گەڕام بەدوای سەرچاوەیێك باسی ئەم مزگەوتەم بۆ بکا.. بۆ ئەوەی بیکەم بەسەرچاوەییکی زانستیانە وە دەرفەتێکیش بچمە بارزان چەند وێنەییکی بەکامیرای خۆم بگرمەوە کەزانیم دووبارە چاپیان کردۆتەوە.. بۆ نووسینەکەم گەڕامەوە سەر کتێبەکەی (پێی ڕەش) (بارزان وحركة الوعي القومي، چاپی ۱۹۸۰، کەخەڵکی ناوچەکەیەو شارەزایی باشی هەیە لەسەر زۆر لایەنی مێژووی مزگەوتەکە لەلاپەڕە (۲٥) کتێبەکەیدا دەڵێ ((دانەری کتێبی (امارە بهدينان دەڵێ شێخ عبدالسلام لەبارزان وانەی دەوتەوە قوتابیانی







نەخشەی مزگەوتی بارزان و ژوورەکانی. لەکتێبی بارزان وحركة الوعي القومي الكردي (پێی‌ڕەش) وەرم گرتووە.



...ست لەهەموو شوێنەکانی کوردستانەوە دەهاتنە لای))
...محلێ لەو ناودارانەی بۆ فێربوونی زانست هاتبوونە
...یان شێخ عبیداللەی نەهری بوو کەکوڕی (سەید طە)یە
...ەسەید طە
...ەریقەی لەمەولانا
...خالید وەردەگرێ،
...تا لەدەوروبەری
...سی سەدەی
...ۆزدەهەم بنەمایێك
...بۆ ناوچەی
...شێخاتی جێگیر
...ەکات، وە
...لاوکردنەوەی
...ناوچەکانی هەکاری خوارو و ناوەند تا
...ەگاتە سەرووی رۆژئاوای کوردستانی
...ێران وە بگاتە نێو نەهریەکان و
شیروانی و مزوریان، بەتایبەتی لەکاتی
شۆڕشگێڕیەتی شێخ عبیداللە نەهری دژی
ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانی وە
هەروەها بەهەمان شێوە لەبارزاندا (مەلا
عبدالرحمن) مۆڵەتی شێخاتی
لەسیەکانی هەمان سەدە وەردەگرێ،
کەکوڕی مەلا (عبداللەی کوڕی مەلا
محمد)ە. بەڵام (عبدالرحمن و عبدالسلام)
خووی خۆیان دا بەزانیاری و فێربوونی
مەعریفی هەر لەمناڵیەوە، وە شێخ
عبیداللەی نەهری لەم مزگەوتەی خوێندوە.
وەگرنگیێکی تەواو دەدرێت بەمزگەوتەکە. (پی
رەش) بەردەوام دەبێ و دەڵێ (ئەو وەستایەی
مزگەوتەکەی دروست کردووە. ناوی لەسەرووی
تاقێکا تۆمار کرابوو کەناوی (عمل باز ابن زریە)یە
بەڵام بەبێ ئەوەی بزانرێ لەچ ساڵێکداو لەکام
رۆژگار. وە هەروەها باسی ئەوەش دەکا
نووسینی ئایەتیش بەدی دەکرا بەڵام بەبێ
ئەوەی بخوێندرێتەوە لەبەر کۆنی نووسینەکە



ژووری کانیەکە، سەیرکە ئاوەکە لەژوورەکە دیارە، ئەو دەرگایەش دەچێتەوە ژووری یەکەم.

ئەم وێنەیەم لەژووری بەپەنجەرەکەوە گرتووە، کە ژوورەکانی یەك لەدوای یەکی تێدا دیارە.



ئەو بەلەکۆنەی دەکەوێتە سەر دەرگای سەرکی و ژووری یەکەمی مزگەوتەکە.

پاشان هەمان چیرۆکی خەڵکەکەش تۆمار دەکا کەلەپێشەکیدا باسمان کرد چۆنیەتی دۆزینەوەی مزگەوتەکە لەژێر خاك.

جا لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵئەدا ئایا لەپاش دۆزینەوەی مزگەوتەکە، گەشە دەدرێ بەزانیاری و بارزان دەبێتە مەڵبەندی فیکر و رۆشنبیری و داوا کردنی عەدالەتی کۆمەڵایەتی و لابردنی ستەمی دەرەبەگەکان؟! یان پێش دۆزینەوەی مزگەوتەکەش هەر هەمان شوێنی جوڵانەوەی ئاینی و رۆشنبیری بووە؟! یا پێش ئەوەی مزگەوتەکەش بکەوێتە ژێر خاك واتا لەرۆژگاری دروستکردنی مزگەوتەگە بارزان هەر شوێنی ئاوەدانی و شارستانیەت بووە.

بەمسۆگەری لەهەردوو حاڵەتی یەکەم و سێهەم بارزان ناوچەیێکی شارستانی بووە، یەکەمیان کاتێ مزگەوتەکە دروست دەکرێ بەم جۆرە تا دەکەوێتە ژێر خاك یا شاردنەوەی لەم جۆرە داگیرکەرێك وە لەحاڵەتی سێهەمیشدا کەمزگەوتەکە دەدۆزرێتەوە بەڵام حاڵەتی دووەم و ناوەندی. ئەمە پێویستی بەلێکۆڵینەوەو پێداچوونەوە هەیە. کەئەو ماوەیەی کەمزگەوتە لەژێر خاك بووە ئەویش نازانرێ لەکەیەوە بۆ کەی بووە؟! کەدەبێ بارزان جۆرە کارەساتێکی بەسەردا هاتبێ. ئەم مزگەوتەش کەوتبێتە ژێر خاك یا بەئەنقەست شاردرابێتەوە.

ئەو ماوەیەش وەك هەمان ماوەیە کە لەم چەرخە بەچاوی خۆمان بینیمان چۆن مزگەوتەکە دووجار





ڕوخێنراو كەوتە ژێر خاك و بارزان چۆن و خاپور بوو لەدوای ساڵی ١٩٧٥ تا ساڵی ١٩٩١ی دوای ڕاپەڕین پاشان چۆن بارزان دووبارە گەشایەوەو پەرە بەئاوەدان كردنەوەی درا. لەنێو بارزانیش مزگەوتەكە.



ئەم ژووره لەناوەڕاستە، سەیری ئەو دەرگا بچوكە بكەن بە پێپلیكە بۆ لای ژووری ناوەكە دەتبا.

كەواتە لەهەردوو حاڵەتدا دەوری كاریگەری دیارە لەسەر ڕووداوەكان و بوونی بارزان بەناوچەیێكی سەركردایەتی كردنی بیروبڕواییكی تازەتر لەهەموو ناوچەكە. وەهەروەها ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ داگیركەراندا.

## ناوی بارزان و پەیوەندی لەگەڵ مزگەوتەكە

ئێمە لەپێشكەیدا باسی ئەوەمان كرد كەوەك (پی ڕەش) باسی كردبوو لەسەر دیواری مزگەوتەكە نووسرابوو (عمل باز ابن زریە) واتا لەدروست كردنی بازی كوڕی زریە. ئاشكرایە كورد وشەی (ابن) بەكارناهێنی یەكسەر دەڵێ (بازریە) وە ئاشكراشە دوو پیتی وەك (زز) كەوتە تەك یەك دەبێتە یەك پیت كەواتە دەبێتە (بازریە) وە بۆی هەیە بەگوێرەی گۆڕانكاری دەماو دەمی ناوكە نەزانین ماناكەی و سوكتری پیتی (ر) لەسەردەم لەپیتی (ز) ناوەكە بوو بێتە (بارزیە) كەوشەكە نزیكە (بارزیا) (بارزا) كەناوی بارزانە.

وەك چۆن (مەروان) بوو بووە (وەرمان) بەجێگۆڕكێی (و) لەگەڵ (م)و پاشوپێشیان بەبێ گۆڕانی مۆسیقا یان مزووری)و (میروزی) كەشوێنی (ز) لەگەڵ (ر) گۆڕاوە ناوی عەشیرەت و دێیكە لەیەك ناوچە. كەنزیك بارزانە.. جگە لەمانەش هەمووی دێك هەیە لەنزیك بارزان ناوی (باز)ە.. كەواتە وشەكە ڕەسەنە..

بۆی هەیە ناوی ئەو كەسەی یەكەم جار بارزانی دروستكردبێ (بازریە) بوو بێ جا چ وەستاكە بوو بێ یان خاوەنەكەی. وەك لەسەرەوە شێمان كردەوە بەگۆڕانكاری بوو بێتە بازریە بارزیا.. (بارزا) كەلەناوچەكە زۆرجار پیتی (ن)ە كە نالێنەوە بڵێین بارزان ئەمە وەك بۆچوونی یەكەم.

بۆچوونی دووەم. من لێرەدا باسی عەشیرەت و هۆزی بارزان ناكەم كەوا ئاشكرایە لەلای هەموومان و زۆر كەسێش لەسەری نووسیوە. بەڵام تەنیا مەبەستەكە ناوی شارۆچكەی بارزانە لەچیەوە هاتووە بەڵكو زێتر بچینە ناخی مێژووەوە. بۆ دۆزینەوەی ڕاستیەكان. وەك لەشێخ عبدالسلامی یەكەمەوە دەگێڕنەوە كەلاپەڕە (٢٥) كتێبەكەی (پی ڕەش) داهاتووە دەفەرمووێ:(من خالدی تەریقەتمە بارزان مەسكەنمە زێباری عەشیرەتمە) (خالدی مەبەستی مولانا خالدی "نەقشبەندیە). كەواتە پەیوەندیێك هەیە لەنێوان بارزان و زێبار.. وە یەكسەر هەست دەكەیت هەمان پەیوەندی زێبەرو بەرزیە كەدەكا ئەم بەرئەوبەری زی زێبەر بەرزێ.. (زێبار)و (بارزا) دەكا دوولای ڕووبارەكەی بادینان نەك ناوی دوو عەشیرەت بۆیێ لەو ناوە گەرام كە كاتی خۆی ڕووبار لێكی نەكردبوون.. یەكەم قووڵ بوونەوە نەخشەیێكی عوسمانیم دەست كەوت كەوا (قەزای زێبار)و (قەزای عەقرە) هەبووە هەردوو قەزا ئەوبەرو ئەم بەری زێیان گرتووە = (بلەی زێبار)= (بلەی بارزان) كەقووڵ تر بووینەوە دەبینین عەشیرەتێك لە(عقر الحمیدی) عەقرەی ئێستا لەقەلای (شوش) میرنشینێكی گەورەیان هەبووە لەزەمانی زەنگی ئەیوبیان وەحەمیدیەكان بەشێكی دیاری سوپای سەلاحەدین بووینە كەواتە بۆمان ڕۆن بووەوە زێبەرو بەرزێ ناویان حەمیدی (هەمیدی



دەرگای سەرەكی و پێپلیكەی لەژووری یەكەمەوە دەچێتە سەرەوە، هەروەها ئەو دەرگایەی بۆ ژووری ناوەكە دەڕوانێ.



...ووە) سەیری گۆڤاری زاگرۆس ژمارە (٧) ...کە کەحەمیدیەکان دەوری کاریگەریان هەبووە ...ەمێژووی سەدەکانی ناوەندی زۆرحار ...ەسەلاتیان تا نزیك موصڵ بووە. وەك لەزۆر ...حێگا لەالفتح القسی ناوەکە دووبارە دەبێتەوە ...ەم حەمیدیانە جیانە لەگەڵ سوارەی حەمیدی کەمەبەست لەسوڵتان عبدالحمیدی عوسمانیە. حەمیدیەکانی (ئاکرێ) عقرە. کەوەك عبداللە ...ەیوبیان لەکتێبەکەی (نوروز در کردستان) ...ەڵێ (ئاکرێ) لەئاگرەوە هاتووە.. کەمەبەست شوێنی ...ئاگرکردنەوەی زەردەشتە هەروەها ئاگری داغ وە ...ە (التاریخ الباهر) لاپەڕە (٤٨) بەر لە(٨٠٠) هەست سەد ...ساڵ باسی نورەالدین زەنگی دەکا کەچۆن قەلاکانی کوردی حەمیدی گرتووە وە لەپەراوێزەکەشیدا دەڵێ قەلاتی عقر) بەناوبانگە. وە بەهەمان شێوە ئیبن ئەثیر ...سی زەنکی دەکا چۆن قەلاتی حەمیدانی گرتووە ...مرانە قەلاتی (عقر) ئاکرێ و قەلاتی شوش کەئێستاش شوێنەوارەکانی ماوە لەنزیك ئاکرێ و لەکتێبی (الحروب الصلیبیە والاسرە الزنکیە)ی شاکر احمد ابو بدر هاتووە کەوا ساڵی ٥٢٧ (عمادالدین زەنکی) عقر شوش)ی گرتووە وەهەروەها ...ەلاپەڕە ١٣٤ی کتێبی (الایوبیون و الشام والجزیرە)ی دانەری ...محەمەد یاسین ئەحمەد داهاتووە کەچۆن سەلاحەدین ئەیوبی ...ەمیرەکانی حەمیدی ناردووە بۆ ...لعقر)و شوێنەکانی سەر بەئەو.

کەواتە لەوکاتەوە پایتەختی زێبەرو بەرزێ (شوش) بووە تا ئەوکاتەش کەئامەژەمان بۆ شیعرە فلکلۆریەکە کرد کەدەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم (شوش) ...دیارە هەر شوێن دەسەلات بووە یا رەمزی دەسەلات داری ...مۆزەکە کەئەمە دەیسەلمێنێ زێباریەکان پاشماوەی حەمیدیەکانن وەحەمیدیەکانیش پاشماوەی (میدیەکان) کەلەدەرفەتێکا بلاوی دەکەینەوە. بەلام لەرۆژگاری عوسمانیەکان دیارە (شوش) سەری دانەواندووە بۆ عوسمانیەکان و باجیان لەخەڵك ساندوە تا بگاتە رادەیێك لەبارزانەوە (شۆرشێك)ی تازەو ئاین ئامێز دژ بەستەمی ئەوان و دەوڵەتی عوسمانی بەرپا بێ داوای رزگاری بکات دژ بە(شوش) بووەستێ وەك لەلاپەڕە (١١٥)ی کتێبەکەی (پی رەش) شیعرە فلکلۆریەکە ئامارەژە بۆ ئەوە دەکا کەدەڵێ (شوش)و (شەرمن) ناتوانی بگاتە هاناتان. کەواتە (شوش) شوشی جاران نامێنێ و دژ بەخۆی دەوەستێتەوە.

یا وەك لەلاپەڕە (١١٦)ی هەمان سەرچاوە دووبارە دەبێتەوە. ئەمەش مانای مانەوەی (قەلای شوش)ەو یا رەمزی کۆنی زێباری و بارزانی کەدەکا (حەمیدیەکان). بەلام دیارە بارزان لەبەر سەختی ناوچەکەو پتەوی ناخی و هەستکردن بەعەدالەتی کۆمەلایەتی و سەربەخۆیی سنوور بەندی رووبارەکان دژ بەداگیرکەر وای لەخاوەنی بارزان و شێخی گەورەی کردوە نەك هەر لە(شوش) بەڵکو لەو هێزەش یاخی بێ کەلەپشت (شوش) وەستاوە. کەواتە ناخی راستەقینەی (شوش) دەپەڕێتەوە بارزان تا پارێزگاری لەناخی راستەقینەی کورد بکاو هەژارانی ناوچەکە.. کەئەمەش گۆڕانکارییێکی حەتمی شارستانیەت و هێزی نەتەوەپەروەری نیشتمان پەروەریە کەسەنتەری هێز لە(شوش)ەوە بکەوێتە (بارزان)و شوش هەمان دەوری مێژوویی خۆی ببینێتەوە ئەمجارەیان بۆ یەکگرتنەوەی هەموو هۆزو چینەکانی کوردەواری لەپێناو ئازادی بۆ کورد لەسەر خاکی خۆی کەکوردستانە.





وێنەی ...: مزگەوتەکە کە لەساڵی ١٩٦٤ بەدەست کیشاومە.



# دەروازەیەک بۆ چەمکی کەسی بەشەری لەکەلەپووری ئیسلامیدا

نووسینی: مەحەمەد ئارکون**
و. لەعەرەبییەوە: نەریمان تاڵب مۆریاسی

* هەموو گروپێکی کۆمەڵایەتی دیاری کراو یاخود هەر نەتەوەیەك، جیهانبینییە (رؤیا) تایبەتەکەی لەو دەستەواژەدا پێك دێت کە پێی دەگوترێت (کەس- الشخص)، ئەو جیهانبینیەش یان بەشێوەیەکی ناواخنیانە لەبیروباوەڕو (سروشتە کۆمەڵبەکان- طقوس الجماعیة)و عورفە باوەکاندا دیار دەکەون، یاخود بەشێوەیەکی ئاشکرا لەپرانسیپو پەندی پێشینان و ئەو حیکایەتانەدا دەردەکەون کە سەرگوزشتەی پاڵەوانەکان دەگێڕنەوە، یا لەدەقە ئایینیەکان و ئەدەبیاتی رەسمیدا دیار دەکەون، بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو کۆمەڵگایانەی نووسینیشیان نییە، (بێر بۆردیۆ) دەستەواژەیەکی داهێناوەو ناوی ناوە (الحس العملي- هەستی کردەنی)[1] یاخود غەریزەی کردەنی راستەوخۆو عەفەوی، ئەم دەستەواژەیە گوزارشت لەسیمای گرنگیتی کردەنیو ئەزمونگەرێتیو ناسراوەییو تێرانەمان نیشان دەدات لەبەهاکان و لەهەموو ئەو شتانەشی کراونەتە سومبوڵو ئەوانەشی ئەندامەکانی کۆمەڵ رێك دەخەنو دایدەمەزرێننو جێگەی هاوکارییە عەفەوییەکان و ئەو میکانیزمانەش پێك دەهێنن کە لەناو کۆمەڵگەدا تەواوی ئەندامانی کۆمەڵێك پێکەوە دەبەستێتەوە.

هەستی کردەنیەك بەم جۆرە دیاری کرابێت، رێ بۆ دەرکەوتنی کەسی ئازاد یاخود تاکێکی سەربەخۆ لەکۆمەڵ خۆش ناکات، رێگەش نادات کەسێکی رەخنەگر دیارکەوێت، تەنانەت ناهێڵێت کەسێکی واش دەرکەوێت توانای ئەوەی هەبێت، لەکۆمەڵو لە نەتەوەکەی (نەتە خاوەن سیما ئایینیەکە)شی لابدات.

گرنگ بوو ئەم مەسەلانە بخەینە روو بەر لەوەی بۆ ناواخنی بابەتەکە رۆ بچین تا بتوانین بەباشترین شێوە مەسەلەی کەس و (پێگەو شوێنەکەی) لەناو کەلەپووری ئیسلامیدا دیار بخەین، ئەو بوارە مێژووییو جیۆپۆلیتیکیو ئەنترۆپۆلۆژییانەی لەناو کۆمەڵگاکاندا دیاردەی ئیسلامێتییان قوڵ کردۆتەوەو چاندویانە زۆر فراوان و جۆراوجۆریشەو لە لێکۆڵینەوەیەکی شرۆڤەکاریشدا ئاڵۆزە.

ئەم بۆچوونە زۆر لەو کۆمەڵگایانەش دەگرێتەوە کە خاوەنی رۆشنبیرییەکی سەرزارەکین - شفهیة- واتە مێژووی نووسینیان نیە، ئەم جۆرە کۆمەڵگانەش بەکەلەپوورێکی سەرزارەکی -دەماو دەم-وە پەیوەستن. زیاتر لەوەی بەنووسینەوە پەیوەست بن. ئەمەش بەو مانایە دێت ئەو کۆمەڵگانە بەکۆمەڵێك رەفتارو ئاکارو دەزگای هاریکارییە (خزمایەتییە) تایبەتییەکانەوە پەیوەستن کە بەقۆناغی هەستی کردەنی لەبەرامبەر بووندا تایبەتن، زیاتر لەوەی بەقۆناغی دەوڵەتی هاوچەرخی نەتەوایەتییەوە پەیوەست بن ناچارین بپرسین: لەکوێدا بۆمان دەکرێت سەرهەڵدانی مێژووییو دیارکەوتنی یاساییو سیاسیو رۆشنبیری (کەسی مرۆیی- الشخص البشري) دەستگیر بکەین؟

پاش تێپەڕبوونی پانزە سەدە لەناو ئەزموونی سیاسیو پیادەکاری (فقهی- ئیجتیهادات)و خوڵقاندنی مەزهەبە عەقائیدییە لاهوتییەکان لەچوارچێوەی ئەوەی ناوی دەنێم (کەلەپووری ئیسلامی)دا ئاخۆ دەبێت کەسی بەشەری چ رێ و جێو پێگەیەکی دەست کەوتبێت، یان پێدرابێت؟

کاتێك دەڵێم کەلەپوور (مەبەستم مانا گەورەکەی کەلەپوورە کە بەفەرەنسی ئاوا دەنووسرێ- Tradition. نەك بەم شێوەیە- tradition)، چونکە بەکارهێنانی پیتی



گـەورە و پیتـی بچـووك (T,t) لـەزمانی فەرەنسـی دا جیاوازیان هەیە، ئەمە شتێکە لەزمانی عەرەبیدا وانییە.

بۆچی بەنووسـینی پیتـی گـەورە بـاس لـە وشـەی کەلـەپووری ئیسـلامی دەکـەین لـەجیاتی ئـەوەی زۆر ساکارییەوە لەئیسلام بدوێین؟ ئەی ناشە چۆن بتوانین ئەو کەلەپوورە بەشێوەیەك دەست نیشان بکەین، تەواوی دەرکەوتـە مێژوویـیو سۆسـیۆلۆژیەکانی ئیسـلام بگرێتەوەو تەنیا لـەچوارچێوەی یـەك هێڵو یـەك رەوتو ـ کە ناراستەیەکی ئەو کەلەپوورەدا نەبێت؟

دەبینین لەلای سوننییەکان باس لەکەلەپوورێکی راست و رەوان دەکرێـت لەسـەر شـێوازی (ئـەهلی سـوننەو جەماعە)، لای ﴿ئەهلی عەسمە (عصمە واتە کەسانی پاك و بێ گونـاه)و دادپـەروەر﴾ بـەو شـێوەیەی شـیعە ئیمامیـەکان باوەڕیـان پێیـەتی بـەجۆرێکی دی باسـی لێوەدەکرێت، دواتـر لـەنێوان خۆیـان و تـەواوی گرووپـە مەزهەبییەکانی دیکەدا کە بەلادەرو گومراو مزەوەر ناویان دەبەن، دژبەیەکیو ناچونیەکی دەخولقێنن[٢].

ئیسـلام نـاوێکی گشـتیەو بەسـەر هـەموو مەزهـەب و قوتابخانە فیقهیو تەفسیرییەکان و هـەموو ئـەو نەتـەوەو گەلانەشدا جێبـەجێ دەبێـت کـە یـەکێك لـەو مەزهـەب و قوتابخانانە پەیڕەو دەکەن، بەم مانایە، تەنیا یەك ئیسلام بونـی نییـە، بـەڵکو بەجۆربـەجۆریتی ئـەو نـاوەندە کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریو زمانیانەی ئیسلامیان تیادا بلاو بۆتـەوە، چەندین شێوازی ئیسـلامەتیش هاتۆتـە ئاراوە، هەر بۆیە دەتوانین باس لەئیسلامی ئەندۆنیزیو ئیسلامی هیندسـتانیو ئیسـلامی تورکـیو، نوزبـەکیو سـینگالیو ئیسلامی ئێرانی...تاد بکەین، هـەر لەبـەر ئەوە دەکرێـت بەپێوانـەی هەریـەك لـەو کۆمـەڵگا جۆراوجۆرانـە بـاری کەسـی مرۆیـی -الشخص البشري- هەڵبسـەنگێنرێت، مەبەستم ئەوەیە دەبێت لەو هەڵسەنگاندنەدا بارودۆخی خۆماڵی بـاوی نـاو هەریـەك لـەو کۆمەڵگایانـە لەبـەرچاو بگیردرێتو دواتریش کاریگـەری کەلـەپووری هاوبەشـی ئیسلام بەسەر هەموویانەوە حسابی بۆ بکرێت، چونکـە رێزگرتـن و پاراسـتنو بەرزکردنـەوەی کەسـی مرۆیـیو چەوساندنەوەییو رق لێبوونەوەشی هـەر پشـت بـەم دوو فاکتەرە دەبەستێت.

لـەلای هـەموو موسـڵمانەکانو بـەجیاوازی مەرجەعـە زمـانیو رۆشـنبیریو مێژووییەکانـەوە، کەلـەپووری ئیسلامی سێ بنچینـەی گـەورەی دەمەزرێنـەری هەیـە کـە بەسـەر تـەواوی موسڵماندا مولزەمن. (مەبەست ئسول- یان بنچینەی ئاینو بنچینەی (فقە)، یەکەمیان: قورئانەو دووەمیـان دوای قورئـان، فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەرەو سێیەمیشـیان: شـەریعەیە ئـەم شـەریعەیەش وەکـو نووسـراوەیەکی قـەزائی -تقنـین القضـائي- یـان نووسراوەیەکە فقهی فەرمان و نەهیەکانی خواوەندە. ئەم نووسراوە یاساییەی (شەرع) بەهۆی ئەو (ئیجتیهاد)ەوە پێکهاتووە کە فەقێکان ئەنجامیان داوە، لەرووی تیورییەوە ئـەو سـێ ئسـووڵە دامەزرێنـەرە لـەقۆناغی سـەرەتایی یەکەمین پێکهاتنی فیکری ئیسلامیدا دروست بوون (واتە لەماوەی نێوان ٦٦١ی زایینی تا ٩٥٠ن)[٤]و لەرێگەی ئەو ریزبەندییە هەرەمییەوەی باسمان کرد دروست بووە، کە یەکـەمیان قورئانـەو دواتـر فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەرو ئەوجا شەریعە (شەرع)دێت.

بەواتایـەکی دیکـە هـەموو دەق و ئامۆژگاریو پێکهاتـە عەقائیدیە، نووسراوەکان کە لەو کەلەپوورە نووسراوییە پیرۆزەدا کۆکراونەتەوە سەر بەو قۆناغە تایبەتەی مێـژووە گشـتییەکەی فیکـرە کـە زۆربـەی جـار بەسـەدەکانی ناوەڕاست (القروسطية) ناو دەبرێت، دواتر بۆ لای ئـەو گرفتانـە دەگەڕێینـەوە، کـە مەسـەلەی قۆناغبـەندکردنی ئەبستمۆلۆژییانەی مێـژووی گشـتی شارسـتانیەتیەکان رووبەروومان دەکەنەوە، ئەویش لەسەدەی شانزەیەمەوە کەلـەپووری مێـژووی ئـەورووپا بەسـەر مێـژووی گشـتی شارستانیەتیەکانیدا سەپاند[٥].

لێرەدا تێبینیەك دەخەینە روو کەلەپورێك بەو شێوازە دیـاری کرابێت دیـارە نموونـەییو ئایدیالیسـتی دەبێت. هـەر بۆیـە هـەر لەبـەر ئـەوەش بـوو وشـەی کەلـەپوورمان بەپیتی گەورە نووسی.

بۆچی لەباسکردنی کەلەپووری ئیسلامیدا نوسیمان Tradition-و نەماننوسـی-tradition؟ چونکـە ئـەو کەلەپوورە لەهەموو کات و شوێنێکدا هەوڵی داوە وەکـو تاکـە کەلـەپوورێکی یـەکگرتوو خـۆی بسـەپێنێو ئـەو کەلەپوورە خۆماڵیانەشی بەر لەهاتنی ئیسلام لەناو ئەو



کۆمەڵگایانەدا هەبوون، پشت گوێیان بخات، نەك هەر ئەوە بەڵکو پاش پشتگوێ خستنیشیان هەوڵی داوە بشیان سڕێتەوە، ئەوەش بەو بیانووەی ئەم کەلەپوورانە بۆ سەردەمانێك دەگەڕێنەوە کە قورئان بەسەردەمی جاهلیەتی ناو بردووە.

﴿جاهلیەت ئەو بارودۆخ و ساتەوەختە دەگەیەنێت کە تیایدا خەڵك ئەو ئایینە رەوایەیان نەزانیوە کە دوایەمین جارو لەرێگەی وەحیەوە خواوەند بۆ پەیامبەری ئیسلام موحەمەد (د.خ)ی ناردووە﴾.

دەست نیشان کردن و نووسینی کەلەپوور بەمجۆرە Tradition لەسەری پێویست دەکرێت هەموو کەلەپوورەکانی پێش خۆی ئیلغا بکاتەوە، بێگومان چەمکەکانی کەلپور بەم جۆرە نووسینە tradition، تەقالیدەکان بۆ ئەو سیغەیە دەگۆڕێت کە هەر لەسەدەی نۆزدەمیەوە زانستی نەژادی مرۆڤایەتیو ئەنترۆپۆلۆژیای رۆشنبیری لەچوارچێوەکەیدا پێکهاتن. لەنێوان ئەو کەلەپوورە پیرۆزە نووسراوەییەی فەقێکان پێکیان هێنابوو، لەگەڵ ئەو کەلەپوورە خۆماڵیانەی بەر لەدەرکەوتنی ئیسلام لەکۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان دا باو بوون، ململانێیەك دروست بوو، ئەمڕۆ ئەو ململانێیە مێژووی رەخنەگرتنو گەشەکردنی تەواوی زانستە کۆمەڵایەتییەکان وایکرد ئەنجام بدرێت. لەپێش هەموویانەوە هەردوو کەلەپووری ئایینی جولەکەو مەسیحی، بۆچی ئەو چاوگێرانە رەخنەگەراییانە یەکەم جار بۆ ئەو دوو کەلەپوورە کران؟ چونکە کەلەپورەکەی ئەورووپا بوو بەر لەهەر کەلەپورێکی دیکە تازەگەرێتی (حداثة)ی بەخۆوە بینیو بەبەردەوامیش لەگەڵ مەترسیو هەڕەشەکاندا روو بەڕووی دەکردەوە، واتە هەر لەسەرەتای دەرکەوتنییەوە تازەگەرێتی (تەحەدیاتی) ئاڕاستەی هەردوو کەلەپوری ئایینی- یەهودی-و مەسیحی کرد.

**پەراوێزەکان:**

١) (بییر بۆردیۆ) ساڵی ١٩٨٠ بەو ناوەوە کتێبێکی نووسیوە، کتێبەکەی دەرئەنجامی توێژینەوەیەکە کەلەناو خێڵە گەورەکانی جەزائیردا ئەنجامی داوە مەبەستیشی لەهەست کردنی شێوازی هەڵسوکەوت کردنی رۆژانەمانە، واتە هەست کردن بەبێ ئەوەی بەشێوەیەکی عەفەوی بیر بکەینەوە، ئەم هەست کردنە لەکۆمەڵگا مەدەنیو دواکەوتووەکان و کۆمەڵگا شارستانیو سەرەتاییەکانیشدا هەیە، هەرچەندە لەکۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا رەهەندی زیاتری هەیە. بڕوانە: Pierre Bourdiur.

٢) وتمان قوڵ بۆتەوە، یان بەدیاردەی ئیسلامی جێنراوە، ئارکۆن ئەم مانایەی بۆ گوزارشت کردن لەو کۆمەڵگایانە بەکاردەهێنێ کە ئیسلام تیایاندا بەقوڵی بڵاو بۆتەوە، هەوەها بۆ ئەوەشە کە بڵێ زۆر فاکتەری دیکەش جگە لە ئاین کار لەو کۆمەڵگایانە دەکات.

٣) ئاشکرایە ئەو روانگەی ئارکۆن لێیەوە دەڕوانێ، هێندە فراوانە هەموو تایەفەو مەزهەبە ئیسلامییەکان (بەبێ لەبیرکردنی کەسیان) دەگرێتەوە، هەرچەندە جیاوازیشیان هەبێ. بەلام سیمای هاوبەشی ئاشکراشیان هەیە، ئارکۆن پێی وایە، ئەوانە لەئەنجامی ململانێو موناقەسە مێژووییەکانەوە زۆر لەیەکدی دوورن، بەلام لەئاستێکی قوڵداو لەئاستی ئەبستمۆلۆژیدا زۆر لەیەکدییەوە نزیکن. لەگۆشەنیگای ئارکۆنەوە ئەوانە یەکسانیشن

٤) ئەم دوو مێژووە (٦٦١-٩٥٠) ئامارژە بەو ماوەیە دەدەن تیایدا دەقە ئیسلامییە بنچینەییە ئەرسۆدۆکسیەکانی سونەو شیعە دروست بوون.

کتێبە تازەکان و مێژووی (فقە)یش لەو ماوەیەدا دروست بوون دیسان ئەو کتێبانەشی بەرگریان لەم مەزهەب و ئەو مەزهەب دەکرد هەر لەو ماوەیەدا دەرکەوتن، ئەوە ماوەی پێکهێنان و نووسینەوە بوو (تكوين والتدوين).

٥) ئەورووپا بوو قۆناغبەندی ئەبستمۆلۆژی مێژووی فیکری بەسەر هەموو پرۆگرامەکانی لێکۆڵینەوە سەپاند، هەر بەو شێوەیە باس لەماوەی یۆنانی- رۆمانی و سەدەکانی ناوەڕاستو. تازەگەرێتیش، بەهۆی هێزو توانای فیکری ئەورووپیو باڵادەست بوونیەوە دەرکەوتوونو ئەو قۆناغبەندییەش بەسەر هەموو رۆشنبیرەکانی جیهاندا سەپێنرا.

* ئەم بابەتە بەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەیەکی محەمەد ئارکۆن، لەژێر ناونیشانی (الاسلام والمستقبل) لەژمارە (٧٢١٢)ی ٢٧/٨/١٩٩٨دا بڵاوکراوەتەوە، کە هاشم ساڵح لەزمانی فەرەنسیەوە کردویەتی بەعەرەبی.

** محەمەد ئارکۆن: ئوستادە لەزانکۆی سۆربۆن لەفەرەنسا.



# خۆری ئیسلام... یان جەوهەری قورئانی پیرۆز!؟

**نوسینی: ب. هاژە**

بەرلەوەی (خۆری ئیسلام) تیشکی زێرینو پرشنگداری بەسەر زەمیندا پەخش بکات: ئەم زەمینە، تاریکستانێك بوو: چاو چاو نەدەدی. بگرە کردارو رەفتارەکان ئالۆز بوونو بەسەر یەکدیدا دەئالۆزکان، چونکە لەسەر بنەماو پرەنیسپی بیروبرواو بۆچوونە راستەقینەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەنجام نەدەدرانو هیچ رێساو یاسایەك لەم بوارەوە نەهاتبووە ئارا کەلەسۆنگەیەوە: یاساو عەدالەتی ئایینی - کۆمەلایەتی جێگای برواو متمانەی خۆی بەسەر جیهاندا بسەپێنێ: بەلێ... لەو مەجالە تەسكو تروسكەی بێ بروایی‌دا، ئەم شەوەزەنگە پەیا بوو بوو، وەك خوای گەورە دەفەرموێت (او لضللمات في بحرٍ لجي يغشاه موج من فوقه سحابٌ ظلماتٌ بعضها فوق بعض اذا اخرج يده لم يكد يراها ومنْ لم يجعل ا الله له نورا مما لهُ من نور....النور/٤٠) یانی کرداری خەلکی بێ بروا وەکو چەند تاریکایی‌و تارماییەك وایە کەلەناو دەریایەکی زۆر قولو بێ بندا بێتو شەپۆلەکانی بەسەریەکدا بداتو لەسەرووی ئەوانیشەوە واتە لەسەر رووی دەریاکە هەورێکی پڕ لەتەمتومانو چڕوپڕی ئەوتۆ هەبێتو پڕ بێت لەچەند تاریکاییەکی لەسەریەك وەك تاریکایی هەورو تەمو مژو بارانو شەوەزەنگو خۆلباران... کەشەپۆل وای لێ بکات کەس پێش خۆی بەدی نەکات، جا گەر بێتو کۆمەلێك بروایان نەبوو. بەم شێوەیە دنیا بۆیان دەبێتە شەوە زەنگ هەروەك خوای گەورە رۆشنایی ئیمانی نەدا بەکەسێك، ئەو کەسە رێگای لێ وون دەبێتو سەری لێ دەشێویو قەتو قەت رێگا نادۆزێتەوەو ناتوانێ رۆشنایی بۆ خۆی دروست بکات، وەك ئەو دنیایەی ئەم ئایەتە بەرزو پیرۆزە، بەر لەهاتنی ئیسلامو هەلاتنی خۆری ئیسلام وەسفی دەکات: ئاوا تاریکۆ تروكو نوتەك بوو. چونکە هیچ جۆرە رێساو یاسایەکی دادپەروەری لەئارادا نەبوو کەمافی خەلکێکی تێدا پارێزراو بێت. بەلکو مافی هیچ کەسێك نەدەدراو بگرە هەموو کەسێك مافی لێ زەوت دەکرا، مەگەر ئەوانەی لەخەلوەتی حیلەبازیو بوختانو فرتو فێلبازیو بێ ویژدانی‌دا وەرکەوتبوونو لەرێگای هەڕەشەو گوڕەشەو چاو لێ سوورکردنەوەو تۆقاندنەوە مافی رەوای خۆیانو خەلکی دەوروبەریان دەخواردو زەوت دەکردو تەنانەت ژیانیان بەرادەیەك لەخەلك تالو شپرزەو تاریك کردبوو کەخەلکەکە بەناچاری لەپێناو ژیانو گوزەرانو مانەوەی وجودی خۆی دەچووە ژێر بارو وەك کەلوپەلو کالای بەر، جەستەی خودی خۆی دەفرۆشتو ئامێر ئاسا دەخرایە ژێر مەزایەدەوە، بەم جۆرە ئەم یاسای کۆیلایەتیە وای لێهات، نرخو بەهای بۆ کەسایەتی مرۆڤەکانو قیەمی ئەخلاقی بەرزی ئادەمیزاد نەهێشتەوە، بەلگەو نمونەش لەسەر ئەوە لەنێو هەندێك لەگەلانی دواکەوتوویی گێتی‌دا، لەمەیدانی سەیرانگاکاندا، دوور لەدابو نەریتو قیەمو کەرامەتی مرۆڤو مرۆڤایەتیو ویژدان وەك (سەگ)و (کەلەشێر) شەڕە دەمو دەندوکەیان بەکۆیلەو



بەندییەکانی مەڕ خۆیان دەکرد تا بزانن کامیان بەرەندەیەو سەرکەوتن لەو مەجالەدا بەدەست دەهێنێ، بەمەبەستی دامرکاندنی ئارەزووی ئاغاکانیان، کەئەویش تەنها زەردەخەنەیەك و قاقایەکی قایمی جارس کارو یەکدوو هاش و هوشی سەرکەوتن بوو بەرامبەر یان، بەلام لەرووی کردارو رەفتارو رەوشتەوە، ئەوە هەر باس ناکرێت کەهیچ جۆرە رەوشتێك نەبووەو بگرە زۆر بەئاشکرا دەروازەی خراپەو خراپەکاری لەسەر پشت بوو، دیارە داگیرکردنی مالی خەلکیش شتێکی زۆر سادە بوو کەبەسەر خەلکی رەش و رووتدا، پیادە دەکرا، ئەسلەن سیستەمی ژن و ژنخوازی و ژن مارە کردن زۆر کەم بوو .. بەلێ.. ئەمانەو سەدان رەفتارو کرداری دزێوی نامرۆڤانە ببووە باوو رووبەرووی جیهانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی ئەوکات و سەردەمە دەبوەوە، تەنانەت لەهەموو روویەکەوە شیرازەی کۆمەل و کۆمەلگا تێك چوو بوو، رەورەوەی ژیان لەسەر وێستگەی خۆی ترازابوو. هەریەکەو بەرەو هەلدێرێك هەنگاوی دەناو گالیسکەی خراپەکاری داژوی، کەزۆر بەداخەوە ئێستا دەبینین ئەو داب و نەریتە کۆنانەی سەردەمی نەفامی و جەهالەت بەنوێخوازو مۆدرێنیزم لەقەلەم دەدرێن! بەلام کاتێك کە(خۆری ئیسلام) نیشتە سەر زەوی و گشت جیهانی جاهیلی و جەهالەتی روونـاك کردەوەو مژدەی قەلاچۆکردنی کۆیلایەتی بلاوکردەوە خوای گەورە بەزەیی بەخەلك داهاتەوەو فەرمانی بەپێغەمبەری پێشەوامان حەزرەتی محەمەد (ﷺ) کردو پێی فەرموو:

(یاایها المدثر قُمْ فانذر، وربك فکبر وثیابك فطهر والرجز فاهجر ولا تمنن تستکثر ولربك فاصبر..المدثر/١-٢-٣-٤-٥-٦

واتا ئەی ئەو کەسەی کەخۆت پێچاوەتەوە لەپێخەف و پۆشاکدا لەخەو رابەو راپەڕە، سەرجەم خەلك ئاگادار کەرەوەو خوای خۆت بەگەورەو مەزن بزانەو خۆتان لەزەبرو زەنگ و چەپەرو جەهالەت پاك بکەنەوەو بت و بتخانەکان بڕووخێنن و منەت بەسەر خەلکدا مەکەن یانی هەر کارێك کەدەیکەن، بۆ خوا بیکەن و پاداشتی لێ وەربگرن. بەئارام بە لەسەر ئەو بانگەوازە خواییە، دان بەخۆتا بگرەو کول مەدەو پشتت سارد مەکەرەوە، ئەوەتا ئەو ئایەتە تێمان دەگەیەنێت کەبەراستی ئاینی خوای گەورە بوو کەفریای ئەو خەلکە بەش مەینەت و ستەم لێکراوە کەوت کەدەفەرموێت:

(فلا اقتحم العقبة ومادراك ماالعقبة، فك رقبة أو اطعامٌ في يوم ذي مسبغته...البلد/١١-١٢-١٣-١٤).

واتا خوا دەفەرموێت: ئێوە قۆرت و کۆسپی گرنگتان نەبڕیوە، ئەو کۆسپەی کەمن مەبەستمە لێی سەرنەکەوتوون، لەبەر ئەوە نازانم من چیم مەبەستەو ئەو کۆسپە چی یە؟ ئەویش ئازاد کردنی کۆیلەو ژێر دەستەکانە، هەروا بلاوکردنەوەی خۆراکە لەرۆژی برسیەتی دا ئەوەش هەولی خوایەو جەوهەری قورئانی پیرۆزو ئیسلامە، کەواتە دەرکەوتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەم جیهانەی بەتیشکی خۆری قورئان لەهەموو بوارێکی ژیان دا روونـاك کردەوە.

وەکو خوا دەفەرموێ:(الله نور السموات والارض- النور ٣٥) واتا خوا رۆشنکەرەوەی ئاسمان و زەوییە، جا لەکۆتاییدا ئومێدەوارین خۆری ئیسلامی وەزارەتی ئەوقافیش هەرچەندە زۆر ئاسان نیە کەسێك هەبێت و بلێت من بەراستی نوێنەرایەتی حەقیقەتی ئەو ئیسلامە جوان و پاکژە دەکەم، بەلام ئێمە لەخوای مەزن خوازیارین (خۆری ئیسلام)ی ئێمەش بەهێز بکات و کەمتا زۆر خزمەتێکی بچوك بەگۆشەیەك لەئاینی پیرۆزی ئیسلام بکات و نیشتمانی کوردستان (بەواتای (سەلام رۆشن و روونـاك بکاتەوە، بەتیشکی زێرینی وەرگیراو ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرمودوکانی پێغەمبەری پێشەو مان (ﷺ) بۆ ئەوەی گەلەکەمان رێگای راستی لێ وون نەبێت و لەسەر جادەپانی ئیسلام نەترازێ و تا خەلکیش بەهەر ناوێکەوە بێت نەتوانێ چەواشەیان بکەن.



# قورئانی پیرۆز...

# پرسیارەکانی نێو شاری هەنگ وەڵام ئەداتەوە

نووسینی
گۆران ابراهیم محەمەدئەمین

لەرۆژئاوا دوای ئەوەی ئاشنایەتیان پەیدا کرد لەگەڵ شاری هەنگ، زۆر پرسیاریان لا وروژا بەبێ وەڵامی مانەوە، ئەم پرسیارانەش دروست بوون سەرامانی شاری هەنگ وەکو ساتێك ورد ئەبوونەوە لەو شانە شەش گۆشەیانە سەریان سوڕ دەما، هەستیان دەکرد لەوپەڕی پتەویدایەو بەجوانترین شێوە ساز کراوە، لەهەمان کاتیش کەمترین کەرەستەی تیا بەکارهێنراوە ئەو پرسیارە لایان چەکەرەی دەکرد، تۆ بڵێی ئەم هەنگە لەکوێ فێری ئەو ئەندازەیە بێ، لەکاتێك هەنگ پێشەوای ئەندازیارانە کەچی خۆ لەهیچ کۆلیج و پەیمانگایەکی ئەندازەییان نەخوێندووە، تۆ بڵێی ئەو ئەندازەی لەکوێ هێنابێ؟ هەروەها ساتێك سەیری ئەو رەوشتی تۆکمەو تێکچڕژاوی هەنگیان ئەکرد بۆ هەڵسوڕاندنی کاروبار، پرسیارێك لایان دووبارە ئەبۆوە، خۆ هەنگ لەهیچ رشتەیەکی (بەشێکی) ئیداریی نەخوێندبوو ئەم شتانەی لەکوێ هێناوە، یاخود ساتێك سەیری هەنگیان دەکرد کەوەستای شیرینی ساز کردنە، بەڵام بێ ئەوەی لەژێر دەستی هیچ شەکر رێژێکا کاری کردبێ، ئەمەش شوێنی سەرسوڕمانە کە لەناوەوەی مێش هەنگوین گەورەترین کارگە هەیە شەربەتی گوڵی رەنگاورەنگی تیا دێتە دەرێ ئەمەش بۆ خۆی پرسیارێکە لەکوێ فێر بوو ئەم وەستایە.

یاخود ساتێك لێکۆڵینەوەی مەیدانییان کرد لەسەر هەنگ بینییان کەوا هەنگ بەلای شتی لاوەکی داناچێ بۆ نموونە پێویستی بەئاو هەیە هەڵدەفڕێ بۆ چۆمەکان و تەنیا ئاو لەگەڵ خۆی دەبا، کەچی دەم ناگەیەنێتە هیچ شلەیەکی تر وەکو کحول و زەیت، باشە لێك دەرکردنی شلەکان لەکوێ فێر بوو ئەمەش پرسیارێکە.

وە هەر لەلێکۆڵینەوەی مەیدانی گەیشتین بەوەی کە هەنگ خاوەن زمانێکی تایبەتن بۆ یەکتر حاڵی کردن بۆ نموونە ئەگەر یەکیان بگات بەناو گوڵزارێك کاتێك هەواڵ بەهەنگەکانی تر ئەگەیەنێت نەك مەوداو تخوب و ماوەی گوڵزارێك کاتێك هەواڵ بەهەنگەکانی تر ئەگەیەنێت نەك مەوداو تخوب و ماوەی گوڵزارەکەیان پێ ئەڵێت بەڵکو چۆنیەتی گوڵ و گیایەکەشیان پێ دەڵێت، ئەم وەسف کردنە سەیرەو ئەو زمانە کێ داویەتی بەهەنگ، یاخود ئەم



کارانە چلۆن لەنێوان ئەو مێش هەنگوینانە دابەش کراون، ئەو نەریتانە چییە کە دەسەلاتی بەسەر ئەم کۆمەڵەیەدا هەیە.

ئەم پرسیارانەو چەندان پرسیاری تر لای زانا مادییەکان بێ وەلام ماونەتەوە. چونکە زانا رۆژئاواییەکان بەردەوام ئەیانەوێ هەموو شتێك بەعەقڵ بخوێننەوە کەچی زانستی (عەقلی) مرۆڤیش سنورداره ناتوانێ پەی بەزۆر شت ببا بەتایبەتی مەسەلەی غەیبی.

(ئیمام غەزالی) قسەیەکی جوانی هەیە کە دەڵێت: ( لایتی عەقڵ لەمیتافیزیقا کوێرە).

زانا رۆژئاواییەکان دەیانەوێ لەهەموو شتێك عەقڵ دەسەلاتدارو سالار بێت وە عەقلیش کەشتێکی لەرادەبەدەر ئەبینێ ئەوەستێ لەبەردەمیا. بەلام قورئان پرسیارەکان شەن و کەو دەکات وەلامیان پێ ئەگەیەنێ.

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وآوحی ربك الی النحل﴾النحل:٦٧.

واتا پەروەردگارت هەنگی فێرکرد، وەحی و ئیلهامی زاتی خستۆتە دەروونیەوە فەرموویوتی ئەو خوایەی کە وەحی بۆ پێغەمبەران ناردووەو پێغەمبەری مەزنی ئیسلامی پەروەردە کردەوە ئەم جۆرە شانە هەنگوینە سازکردنی بەهەنگ فێری کردووە ﴿ان اتخذی من الجبال بیوتا﴾ لەناو قەلشی تاشەبەرد هێلانە چێ بکە لەبەر ئەوەی کێوەکان دەستی کەم کەسی ئەگاتێ بۆ شانە نانەوە باشن، وە لەناو بۆشایی داریشا شانەو لانە ساز بکە.

﴿...ثم کلي من کل الثمرات...﴾النحل:٦٨.

سا لەشیری هەموو جۆرە میوە (وە خونچەو گوڵ گیاییك) بخۆ.

﴿فاسلکي سبل ربك ذللا﴾ النحل:٦٨.

سا بەراستە رێگای پەروەردگارتا برۆ.

﴿یخرج من بطونها شراب مختلف الوانه﴾.

لەدەروونی مێش هەنگوین شەربەتگەلی رەنگاو رەنگ دێتە دەرێ.

﴿فیه شفاء للناس﴾ النحل:٦٨. هەنگوین داودەرمانە بۆ مرۆڤ.

﴿ان في ذلك، لآیة لقوم یتفکرون﴾النحل:٦٨.

لەشاری مێش هەنگوینا نیشانە هەیە لەسەر هەبوونی پەروەردگار بۆ ئەوانەی هزر ئەکەن لە پرسیارەکان هەمووی تەواو دەبن بەئیمان هێنان بەخواو قورئان، وەکێشەکان تەواو دەبن، بەلام لایتی عەقڵ هەموو شتی بەتەنیا هەموو شتی شەن و کەو ناکرێ.

سوودم لەم سەرچاوانە بینیوە:

١- الموسوعه فی علم النحل، محمد خلیل الباشا.

٢- اطلس زنبور عسل نوشتەء، مهندس د. یوردن ترجمه وتألیف دکتر مهندس نعمت الله شهرستانی.

٣- نووسراوێکی عەبدولکەریم بێ ئازاری شیرازی.

٤- المنقذ من الضلال والموصل الی ذي العزة والجلال (الامام الغزالي).





# قورئانی پیرۆز لەشیعرەکانی مەلا خەلیلی موخلیسدا

جەلال مەولود ئەحمەد

**پەیڤێک لەژیانی موخلیس:-**

* حاجی مەلا خەلیل کوڕی فەقێ رەسول کوڕی حاجی مستەفای سنجاویە، لەساڵی ١٩١٠ی زایینی بەرامبەر بەساڵی ١٣٢٩ی کۆچی لەرەشماڵان لەدەشتی قەراج لەدایک بووە.

* لەمزگەوتان لای ئەم زانا بەرزانە خوێندویەتی (مەلا رەشیدی موکریان، مەلا قادری سوریژەیی، مەلا حمەدەمین سوێری، مەلا شێخ جەلالی بەرزنجی، مەلا ئەحمەدی رەش).

* لەساڵی ١٩٤٣- ١٩٤٤ ئیجازەی مەلایەتی لای (مەلا ساڵحی کۆزەپانکە) وەرگرتووە لەمزگەوتی تەکیەی شێخ نوردەدین لەهەولێر.

* لەساڵی ١٩٤٤ هاتۆتە ژێر باڵی تەریقەتی نەقشبەندیو شێخ مستەفای کردۆتە رابەری خۆی.

* مەلای گوندی دووسەرەی فەتاح ئاغا بووە، پاشان لەمزگەوتی حاجی تەها قەسابو مزگەوتی شێخ مستەفا لەهەولێرو شەقڵاوە.

*لە ١٩٨٥/٦/٥ کۆچی دوایی کردوە لەگردی پیرداود بەخاک سپێراوە.

بەهەڵدانەوەی لاپەڕەکانی دیوانە دەست خەتەکەی موخلیس یان دیوانی موخلیس کە ماجستێر نامەی رێزدار د ...براهیم ئەحمەد شوانە، دیار ...دکەوێت کە شیعری ئایینی ...اڵە بەسەر سەرجەمی دیوانەکە ...ەتایبەتی ئەو شیعرانەی کەدوایی ساڵی ١٩٤٤ رێکی ...حستوون، واتە دوایی ...ودرگرتنی تەریقەتی ...ەقشبەندیو گرتنی رێگای ...سۆفیگەری لێوەرگرتن ...اقتباس) لەقورئانی پیرۆزو ...ەرمودەکانی پیغەمبەر (ﷺ) ...ی بەشی رووبەری دیوانەکەی پۆشیوە.



بۆ نموونە ئەم واژانە زۆر دووبارە دەبنەوە:-

(طور، سبحانك، قالو بلى، الست بربكم، سورەت) هەروەها چەندان حیکایەتی قورئانی وەك ناوهێنانی:( یوسف موسى، عیسى، ابراهیم، ئادەمو حەوا...) وەیان ئیشارەت کردن بەبەشێکی ئایەتی پیرۆز وەیان شیعرەکە بەمەبەستی ئایەتێك یان حەدیسێك دانراوە یان حیکایەتێك دێنێتەوە یادو ئامۆژگاری مرۆڤ دەکات.

سەرتاپای غەزەلخوانیە



سۆفیگەریەکانی موخلیس سوتانە لەرێگایەکی پیرۆز بەرەو جیهانی نەمری وەك دەبینین:-

لەشیعری (مستەفا) موخلیس دەڵێ:-

تۆ حیجازیو من عێراقی لێکتری‌دوورین بەجێ
دڵ لە درەگای بارەگای تۆ رۆژو شەو ئاوا دەکا
چونکە (سبحان الذی اسری) لەبۆ فەزڵی تووە
تازە موخلیس دێت‌و کەشفی حیکمەتی ئیسرا دەکا

شاعیر هەستێکی ناسك بەرامبەر بەپێغەمبەر (ﷺ) دەر دەبڕێ‌و لەخوای گەرەکە پتر هێزو گوڕی بداتێ‌و زیاتر لەنوری پاکی خۆشەویستی نزیك بکاتەوە، هەروا تازە موخلیس دەیەوی کەشفی حیکمەتی ئیسرا بۆ خەڵك بکات، کاتی خوای گەورە ئەمری بە فریشتە کان کرد شەو ڕۆ بە محەمەد (ﷺ) بکەن لەیەك شەودا نهێنییەکانی ئاسمانیان نیشانداو لەرێگای مزگەوتی (الاقصی) گێڕایەوەو ئەوێشی موبارەك کرد.

ئیشارەتە بەم ئایەتە:-

(سبحان الذی اسری بعبده من المسجد الحرام الی المسجد الاقصی الذی بارکنا حوله لنریه من ایاتنا انه هو السمیع البصیر) الاسراء (١).

لەشیعری (دووپارچە مانگ) دەڵێ:-

زوڵفی پەرت بوو رووی بووە دوو پارچە مانگ
جاءت الساعـــــة وانشق القمـــــر

واتە کەزولفی ڕەشی لەسەر کوڵمی سپی لاچوو هەردوو لا کوڵمی وەك دوو پارچە مانگ لەژێر هەوری ڕەشی پرچی بەدیار کەوتن، بوونی مانگ بەدوو پارچە ئیشارەتە بۆ ئایەتی:-

(اقتربت الساعه وانشق القمر) القمر (١).

بەهەمان شێوە موخلیس لەقەسیدەی (هەیهو.. هەیهو) وەسفی دیمەنی جوانی دەرکەوتنی کۆڵمی یار لەژێر هەوری ڕەشی پرچی ڕەشماڵ شێوە دەکات‌و دەڵێ:

شەو لەمەجلیس یار کە زوڵفی لەسەر روو لادەدا
مانگە شەو پێویست نەبوو. شەمعی شەبستانم هەبوو

هەر لەشیعری دوو پارچە مانگ موخلیس دەڵێ:

من حبیبی لیس لي الا الفراق
والفراق هو ادهی وامر
لیس یدری ان مایاتی به
من صغیر وکبیر مستطر

واتە لەدابڕان‌و دوور کەوتنەوە هیچ خۆشیەکی دیکەم لە یار دەست نەکەوت، هەردەم بە ئاهی زەمانە دەناڵم‌و شەرابی هیجرەت دەنۆشم، ئایا لەدابڕان شومترو تاڵتر هەیە؟! ئیشارەتە بۆ ئەم ئایەتە:-

(بل الساعة موعدهم والساعة ادهی وامر) القمر (٤٦)

دێڕی دووەمیش ئیشارەتە بە :(وکل صغیرو کبیر مستطر) القمر ٥٣

* * *

لەشیعری (ساحێب قڕانم) موخلیس دەڵێ:

ئەگەر ساقی بدا مەی تا بەیانی
دەزانم (لیله القدر)ە دەزانم
لەمەیخانە ئەگەر مەرگم نەسیب بێ
شەهیدی زاویەی (بیت الامان)م

(لیلة القدر) لەشەوە تاکەکانی دوایی بیستی (٢٠)ی ڕەمەزانە، کە قورئانی پیرۆزی لێ هاتۆتە خوارەوە:

(انا انزلناه في لیلة القدر) القدر (١)

(لیلة القدر خیر من الف شهر) القدر (٣)

شاعیر لەهەندی جێگادا لەگەڵ ناوهێنانی (لیله القدر) باسی (شەوی بەرات)یش دەکات، هەردوو شەو نیشانەی تاعەت‌و تەقواو خۆشی‌و خێرو بەرەکەت دەبەخشن، شەوی (بەرات) شەوی نیوەی مانگی (شەعبان)ە، واباوە لەم شەوەدا (رزق)و (عومر- تەمەن) تازە دەکرێتەوە لەکوردستاندا مندالآن لەم شەوەدا بەکۆمەڵ لەماڵان دەسورێنەوە دەڵێن:-

(ئەمشەو شەوی بەراتێ
خوادوو کوڕو کچێکتان بداتێ

ئینجا ماڵەکان شیرینیان دەدەنی. مەلای جزیری لە شیعرێکیدا دەربارەی (لیله القدر) دەڵێ:-

هندەکی رۆژو شەڤن تێك عیدو (لیل القدر) بن



# ئاشنایەتی (گۆتە) لەگەڵ ئەدەبی رۆژهەڵات و قورئانی پیرۆز

نووسینی: سەباح مەجید محەمەد

**گۆتە کێیە؟**

(یوهان فۆن گۆتە) لە (٢٨)ی ئابی سالی (١٧٤٩) لە شاری (فراکفۆرت) هاتۆتە دونیاوە، یەکێکە لەشاعیرە مەزنەکانی ئەلمانیاو جیهان. بەیەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەدەبی ئەلمانی دادەنرێت، گۆتە شارەزاییەکی زۆری لەزمانەکانی لاتینی، گریکی، فەرەنسی، ئیتالیو ئینگلیزیدا هەبوو.

گۆتە کۆمەڵێکی زۆر لەبوارە تۆکمەکانی ژیانی لەبۆتەی کەسایەتیدا حەشار دابوو بەجۆرێ: ئەدیبو هۆزانڤان و شانۆنامەنووس و رۆمانووس و مێژوونووس بوو، وێرای ئەمانەش مافناسو وێنەکێشو فەیلەسوفو وەزیر بوو.

شایانی ئاماژە پێکردنی گۆتە لەسالی (١٨٣٢) شانۆنامەی (محمد)ی نووسیوە کە باس لەژیانی پێغەمبەری ئیسلام(د.خ) دەکات، گۆتە لە (٢٢)ی مارتی سالی (١٨٣٢) مالئاوایی لەم دونیایە کردووە.

## ئاشنایەتی گۆتە لەگەڵ ئەدەبی رۆژهەڵات:

گۆتە سالی (١٧٧٠) -کە ئەوساتە تەمەنی بیست سال بوو- لەشاری (شتراسبۆرگ) ئاشنایەتی لەگەڵ ئەدیبی بەناوبانگ (یوهان هردر) پەیدا کرد. ئیتر گۆتە لە(هردر)ەوە زۆر شت فێر بوو، لەم بارەیەوە دەلێ: (لەرێگەی -هردرەوە- قوتار بووم لەئەدەبی دروستکراو و شیعری زۆر لەخۆکردن. بەلکو دەست نیشانی ئەدەبی تەبیعیو رێچکەی نووسەرانی وەك -شکسبیر-و عەرەبەکانی بۆ کردم. هەر ئەمەش بوو وای لێکرم سەرگەرمی خوێندنەوەی ئەدەبی رۆژهەلات بم، کە ئەو کاتە وەرگێردرابوونە سەر زمانی لاتینیو ئەلمانی).

گۆتە یەکەمین کاری وەرگێرانی (٦١) دێری موعەللەقاتی (امرؤ القیس)ی شاعیری ناوداری عەرەب بوو بۆ سەر زمانی ئەلمانی. ئەمەش وەنەبێ گۆتەی لەنگەر پێگرتبێ تەنیا لەخوێندنەوەو وەرگێران، بەلکو بەزەقی بەروخساری کارە ئەدەبییەکانیەوە دیار بوو.



هەروەها گۆتە کاریگەر بووە بە بەرهەمەکانی شاعیری مەزنی ئێرانی (حافزی شیرازی)، هەروەکو خانمی پرۆفیسۆری ئەڵمانی (کاترینا مومزن) -کەوا لێکۆڵەرەوەیەکی بەرهەمەکانی گۆتەیە- لەیەکێك لە لێکۆڵینەوەکانیدا بەناوی (ئایا گۆتە موسڵمان بوو؟) دەڵێ: (حافزی شیرازی سەرمەشق و سمبولی گۆتە بوو، گۆتە بەپەیوەندی و سەلیقەو شەوقو زەوقەوە شیعرەکانی شیرازی زەمزمە دەکردو دەیخوێندەوە).

هەروەها دەڵێ: (مەعریفەت حوانمەردی، هەستی شاعیرانە، ئەو پەڕی چێژو سەرمەستی تێگەیشتنە سمبولیەکان، کەرەسەی خاوی گۆتە بوون، کە لەشیرازییەوە فێریان ببوو. لەهەمان کاتدا خۆی لەسەر رام دەکردن و فراژووی دەکردن، پەیوەست بوون و عیشق و ئەوینی گۆتە بەحافزی شیرازییەوە دەکرێ لەتێکستی شیعرەکانیدا بدۆزرێتەوەو بزانرێت کە چ پابەستبوونێك و هۆگر بوونێك دروست بووە لەنێوان ئەم دوو شاعیرە).

شایانی باسە گۆتە بەشاعیری گەورەی گەلی کوردمان (مەلای جزیری) کاریگەر بووە، هەروەکو گۆتە خۆی لە(دیوانی رۆژهەلاتی نووسەرێکی رۆژئاوا)دا -کەوا (عبدالرحمن بدوی) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی- ئامارەی بۆ شاعیرێك کردووە کە نازناوەکەی (نیشانی)یە، ئاشکراشە (مەلای جزیری) هەرچەندە نازناوی (جزیری) بووە، بەلام هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا نازناوێکی تریشی هەبووە، ئەویش (نیشانی)یە، بۆ نموونە، دەلێ:

(( ژ حوسنا بێ نیشان نادی نیشانەك
(نیشانی) گەر ژ دل نەکرا تە پەرهێز))

هەروەها دەلێ:

((وەك (نیشانی) نەقش و نیشانەك تەدی ئێ کو نیشانەك تە دی کانێ خەلەت))

هەروەها گۆتە بەشاعیری ناوداری ئێرانی (سەعدی شیرازی)ش کاریگەر بووە، وە گۆتە پێشتریش چیرۆکەکانی (هەزارو یەك شەوە)ی خوێندبۆوە.

ئەم سەرچاوانەی باسمان لێوەکردن یارمەتی گۆتەیاندا، کە شارەزایی لەئایینی ئیسلام پەیدا بکات، بەتایبەتی (حافزی شیرازی) زۆر کاری لێکردووە، هەروەکو خاتوو (کاترینا مومزن) دەلێ: (گۆتە لەرێگەی خوێندنەوەی شیعرەکانی شیرازی - کەشاعیرێکی سۆفیگەری بووە- ئاشنایەتی زیاتری لەگەڵ قورئاندا پەیدا کرد).

## رەنگدانەوەی ئایەتەکانی قورئان لەشیعرەکانی گۆتەدا:

گۆتە لەتەمەنی (٢٣) سالیدا، واتە: لەسالی (١٧٧٢)دا، بۆ یەکەمجار چاوی بەوەرگێڕدراوێکی (لاتینی) قورئانی پیرۆز دەکەوێت -کەلەسالی (١٤٢٣) لە(بازل) لەلایەن (تیۆدۆر بی بلیاندر)ەوە بەچاپ گەیشتووەو (مارتین لۆتەر) پێشەکی بۆ نوسیوە- هەرچەندە ئەم وەرگێڕدراوە چەندین هەڵەو ناتەواوی -کەلەوەرگێڕاندا بەسەر قورئاندا هێنراون- تێدا بووە، بەلام دیسانەوە گۆتە کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەم وەرگێڕدراوە. ئەگەر سەیرێکی بەرهەمەکانی گۆتە بکەین، ئەوا دەگەینە ئەو راستیەی کە گۆتە تارادەیەکی زۆر بەقورئانی پیرۆز کاریگەر بووە، بەتایبەتی لە(دیوانی رۆژهەلاتی نووسەرێکی رۆژئاوا)دا، لێرەدا هەندێك لەشیعرەکانی گۆتە بەنمونە دێنینەوە، مشتێك نموونەی خەروارێکە، گۆتە لەم شیعرەیدا دەلێ:

((خودای تەنیا، هەر یەکێکە
خوای تاقانە، بێ خەوشێکە
نە لەدایك بووەو
نە کەسی لێ بووە))

گەر سەرنج بدەینە ئەم شیعرەی سەرەوە، دەبینین گۆتە بەشێوەیەکی راستەوخۆ سورەتێکی قورئانی هێناوەو بەشیعر دایرشتووە. ئەویش سورەتی (الاخلاص)ە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قل هو



الله احد، الله الصمد، لم يلد ولم يولد. ولم يكن له كفواً احد).

هەروەها گۆتە دەربارەی ئایەتەکانی (١٧)و (١٨)ی سورەتی (الرحمن):

﴿رب المشرقين ورب المغربين، فبأي آلاء ربكما تكذبان﴾الرحمن:١٧-١٨. دەڵێ:

((خوداوەندی دوو رۆژهەڵات
خوداوەندی دوو رۆژئاوا
دەی کام یەکێك لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان
بەدرۆ دەزانن؟))

لەشیعرێکی تردا دەڵێ:-

((خودا ئەستێرەکانی دروست کردووە
هەتاکو رێنمایی ئێوە بن
لەدەریاو لەووشکانیدا))

وە خوداوەندیش دەفەرموێ:

﴿وعلامات وبالنجم هم يهتدون﴾ النحل(١٦).

هەروەها گۆتە دەربارەی حەزرەتی عیسا (سڵاوی خوای لێبێت) دەڵێ:

((مەسیح کەبێ خەوش بوو
لەتەنیاییدا بیری لەخوای تاقانە دەکردەوە
هەر کەسێك کە ئەوی بەخوا دادەنا
رۆحی پاکی ئەو لێی بێزار بوو))
(دیوانی رۆژهەڵاتی نووسەرێکی رۆژئاوا.

## دوا پەیڤ:

گۆتە دوانی زۆری لەسەر کراوە، بۆ نموونە: پەرناسیەکان بە هونەرمەندێکی نموونەیی (مثالی) لەقەڵەم دەدەن. (لوکنت) دەڵێ: بانگەوازی بۆ فەلسەفەی هیلینە دەکرد، (کارلیل) بەسەرکردەیەکی نوێی دادەنێت بۆ گەلەکەی، (کاتیرینا مومزن) بەئیسلامی دادەنێت، بەڕێز (د. مارف خەزنەدار)یش بڕوای وایە کە ویستوویەتی ئایینە (موەحیدەکان) واتە: جولەکەو مەسیحیو ئیسلام. لێك نزیك بکاتەوە، وە گۆتە پێشی گوتراوە (رووناکی هەمەلایەنە)، (د. محمد غنیمی هلال) دەڵێ: لەپاڵ شتە باشەکانیدا باسی گاڵتەجاڕی و دڵداریو شتی تریشی کردووەو لەکارەکانیدا سۆزی دڵی زاڵتر بووە بەسەر عەقڵیدا، (ناپلیۆن پۆنابرت) لەوەسفیدا دەڵێ: گۆتە گەورەترین و مەزنترین شاعیری تراژیدی ئەڵمانیایە.

پەراوێز:

(*) بۆ زیاتر شارەزا بوون لەم بابەتە بڕوانە: گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٨)ی ساڵی ١٩٨٤، کە بابەتێکی بەزمانی عەرەبی تێدا بڵاو کراوەتەوە بەناوی (لەنێوان گۆتەو جزیریدا) لەنووسینی (عبدالرحمن مزوری).


سەرچاوە عەرەبیەکان:

١- القران الكريم.
٢- الادب المقارن، د. محمد غنيمي هلال، ص٢٩٣.
٣- الغرب نحو الدرب، محفوظ العباسي، ص٥١،٥٢،٥٧،٢٧٣.
٤- الديوان الشرقي للمؤلف الغربي، ترجمة: عبدالرحمن بدوي، ص١٤٤-١٤٥.
٥- مدخل الى تاريخ الادب الاوروبيه، د. عماد حاتم، ص٢٦٥،٢٦٧.
٦- مجله الفيصل، عدد (٣١)، ص٦٠.

سەرچاوە کوردیەکان:

٧- گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٨)ی ساڵی ١٩٨٤، ل٩١-٩٢.
٨- گۆڤاری پەیامی راستی، ژمارە (٤١)ی ساڵی ١٩٩٥، ل٨٤-٨٩.
٩- گۆڤاری جەماوەر، ژمارە (٦٤)ی ساڵی ١٩٩٦، ل٦٤-٦٥.
١٠- موحازەرەکانی بەڕێز (د. مارف خەزنەدار)، قۆناغی سێیەم، کۆلیجی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەدین، ساڵی خوێندنی (١٩٩٦-١٩٩٧).



# کورتەیەک دەربارەی: تەڵاق لەشەریعەت و یاسادا

ماف پەروەر: عزەدین رەزا

سروشت و ناوەڕۆک و ئامانجی گرێبەندی هاوسەرایەتی (عقد زواج) لەگەڵ گرێبەندەکانی دیکەدا جیاوازیەکی زۆری هەیە، بابەتی گرێبەندەکە مافێکی بەرجەستەی ماددی نییە بەڵکو (گرێبەندێکە لەنێوان ژن و پیاوەوە پێک دێت. بەپێی ئەو گرێبەندەوە ژنەکە بۆ پیاوەکە حەڵاڵ دەبێ بەئامانجی دروست بوونی پەیوەندی ژیانێکی هاوبەش و وەچە کەوتنەوە) بۆ هاوبەشی کردن لەبەردەوام بوونی ژیان و مرۆڤایەتی، کەچی هەموو جارێک ئەو هەڵبژاردنەی لەنێوان ژن و پیاوەوە دەکرێ بەرێک و پێکی و بەپێی خواست و مەبەست دەرناچێ، یان لایەنێک بەهەڵەدا دەچێ یان جیاوازی کەسێتیەکان، بەهۆی جیاوازی لەشێوەی پەروەردە کردن و خانەوادەو دەوروبشتی کۆمەڵایەتی یان هەر شتێکی دیکەی جیاواز لەنێوانیاندا هەبێت، تا دەگاتە ئەوەی کێشەو تەنگوچەڵەمە دەکەوێتە نێوانیانەوە لەدواییشدا شیرازەی بەیەکەوە ژیانی ئەو خێزانە تێک دەچێ و ئاڵۆز دەبێ. ئیتر دەست لەیەک بەردان و جیابوونەوە جێگای خۆشەویستی دەگرێتەوەو شەڕو ئاژاوە چەقی ڕێگایان لێ دەگرێ. لەو کاتەدا تەڵاق دان وەکو شتێکی پێویست خۆی دەسەپێنێ بۆیەش میللەتان هەر لەکۆنەوە تەڵاق دانیان پیادە کردووە، شەریعەتە ئاسمانیەکان و یاسا دەستکردەکانیش بەهەمان شێوە، ئەو مافەیان بەهاوسەران داوە. شەریعەتی ئیسلامیش دانی بەو سیستەمەدا ناوە لەپێناوی خێرو خۆشی موسوڵمانان و بەرژەوەندی خێزان بەجۆرێکدا دادخوازی تیادا ڕەچاو بکرێت، و چەند ڕێو ڕەسمێکی ڕێکوپێکی بۆ ژیانی هاوسەرایەتی داناوە چونکە خێزان بەیەکەم بنکەی کۆمەڵ دەژمێردرێت، ڕێگای بەپیاو نەداوە وەکو کاڵایەک بەئارەزووی خۆی مامەڵە لەگەڵ ژن بکات. بەڵکو جێگای تایبەتی بۆ داناوە هەروەها بۆ تەڵاق دانیش ڕێوشوێن و مەرجی تایبەتی و سنووری دیاری کراوی بۆ داناوە. نابێت پیاو بەئارەزووی خۆی هەر کاتێک بیەوێت و بەبێ هۆی ڕەوا ژنەکەی تەڵاق بدات.

تەڵاق دان: هەڵگرتنی پەیوەندییەکانی هاوسەرایەتیە یەکسەر یا لەدوارۆژدا، هەروەها لەماددەی ٣٤ی یاسای باری کەسیدا بەم جۆرە پێناسە کراوە: تەڵاق: لابردنی پەیوەندی هاوسەرایەتیە لەلایەن پیاوە یان وەکیلەکەی. ژنەکەشی بەوکیلایەتی پیاوەکەی دەتوانی تەڵاق بدا یان بەهۆی قازی شەرعیەوە، تەڵاق دانیش دەبێ بەو شێوە تایبەتیە بێ کەشەرع دایناوە دەنا ناکەوێت. ئەگەر تەڵاقدانە کەجیا کەرەوە (بائن) بێ ئەوە گرێبەندی هاوسەرایەتیەکە هەڵدەوەشێتەوە، پاشان نابێت ئەو دوو هاوسەرە بەیەکەوە بژین چونکە لەیەک حەرام دەبن. بەڵام ئەگەر تەڵاقی گەڕاوە (رجعی) بوو ئەوە لەکاتی عید دەدا وەکو (حەنەفیەکان و جەعفەریەکان و کۆمەلی حەنبەلیەکان و زەیدیەکان و ئەبازیەکان رایان وایە) ژنەکە بۆ پیاوەکە حەڵاڵە. تەڵاق دوو جۆری هەیە لەشەریعەتدا هەروەکو لەیاسای باری کەسیشدا لەماددەی ٣٨دا هاتووە: تەڵاق دوو بەشە:

١- گەڕاوە - رجعی- ئەوەش ڕێگا بەپیاوەکە دراوە لەکاتی عیددەدا بگەڕێتە لای ژنەکەی بەبێ گرێبەندی تازەوە.

٢- جیاکەرەوە - بائن- ئەوەش دوو بەشە:

١- جیاکەرەوەی بچووک: ڕێگا بەپیاوەکە دراوە ژنە



تـەڵاق دراوەکـەی لەمـەڕ خـۆی بەگرێبـەندێکی تـازەوە بگەڕێنێتەوە لای خۆی.

٢- جیا کەرەوەی گەورە: ژنە تەڵاق دراوەکەی کەسێ جاری جیا جیا تەڵاقی داوەو عیدەدەشی بەسەر چوو بێ لەپیاوەکە حەرام دەبێ؟

کەواتە لەتەڵاق دانی یەکەم و دووەم کەعیددەی بەسەر بچێ مێردەکە ناتوانێ ژنە تەڵاق دراوەکەی بگەڕێنێتەوە لای خۆی بەبێ گرێبەندو مارەیی تازەوە.

بەڵگەی بەڕەوا بوونی تەڵاق دان

بەڵگەی بەڕەوا بوونی تەڵاق دان لەقورئانی پیرۆز وتە بەنرخـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ)و ڕای گشـتی زانـا موسوڵمانەکان و قیاس داهاتووە:

١- بەڵگەی زۆر لەدەقەکانی قورئانی پیرۆزمان دەست دەکەوێ کەتیایدا هاتووە دەکرێ مرۆڤ پەنا بۆ تەڵاق دان ببـات ئەگـەر حاڵەتەکـە پێویسـت بـوو و هیـچ ڕێگـا چارەیەکی دیکە نەبێت وەکو لەقورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بۆ کراوە بەم جـۆرە هـاتووە: (لاجنـاح علیکـم ان طلقتـم النسـاء مـا لـم تمسـوهن او تفرضـوا لهـن فریضـة)البقـرة/٢٣٦. واتــە هیــچ بەرپرســیاریەتیەك ناکەوێتە ئەسـتۆتان وەکـو پابـەند بـوون بـەمارەیی دان و شتی تر ئەگەر پێش ئەوەی لەگەڵی جـووت بـن تـەڵاقی بدەن و بەر لەدیاری کردنی مارەیی بێت.

هـەروەها دەفـەرموێ (یاایها النبي اذا طلقتم النساء فطلقوهـن لعدتهـن) دەفـەرموێ ئەگـەر ژنتـان تـەڵاقدا حیسابی عیددەیان بکەن لەتەڵاقی گەڕاوەدا ژنەکە لەماڵی هاوسـەرایەتی دەمێنـێ تـاوەکو عیـددەی تـەواو دەبـێ. ئـەویش بەپێچەوانـەی تـەڵاقی جیاکەرەوەیـە کـەعیددەی بەسەردەچێ کەسێ مانگە. خوای گەورە باسی لەتـەڵاق دانی کردوە کەدووجار ڕەوایـەو پیـاو دەتوانـی ژنەکـەی بگەڕێنێتەوە لای خۆی بـەڵام جـاری سـێیەم لێـی حـەرام دەبێ وەکو بەم جـۆرە هـاتووە:(الطـلاق مرتـان فأمسـاك بمعروف او تسریح باحسان)البقرة ٢٢٩

٢- وتەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) جەخت لەسـەر قورئـانی پـیرۆز دەکـات و دەفـەرموێ (ابغـض الحـلال عنـدا الله الطلاق)رواه ترمذي، لەنێو ئەو شتانەی ڕێگایان پێدراوەو حەڵاڵن خودای گەورە لەهەموو شتێك زیاتر ڕقی لەتەڵاق دەبێتـەوە، واتـە تـەڵاق حەڵاڵـەو ڕێگـای پێـدراوە بـەڵام خودای گەورە پێی خۆش نیە. پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر بێ حەفسـەی خێزانی تـەڵاق داوەو پاشـان خـودای گـەورە داوای لێ دەکا بیگێڕێتـەوە لای خـۆی، جاری واش بـووە یـارانی پێغەمبـەر (ﷺ) ژنـی خۆیـان تـەڵاق داوە. وەکـو عومـەری کـوڕی خـەتاب ژنەکـەی (دایکـی عـاسمی) تـەڵاق داوە، عەبدولرەحمان کوڕی عوف ژنەکەی ناوی تەمازور بـوو تـەڵاقی دا، ئەگـەر پیـاوێك نێـوان خـۆی ژنەکـەی بەجۆرێك تێك بچێت نەتوانێت ئیتر لەگەڵیدا ژیان بەسەر ببات. بەردەوام بوون لەسەر ئەو جۆرە هاوسەرایەتیە بێ هودەیە تەڵاق دان و لەیەك جیابوونـەوە باشـترە. چونکـە پیاوێك ژنەکەی لەلای خۆی بهێڵێتەوە لەیەك نەگەیشتن و ناڕێکیش باڵی بەسەر ژیانیادا کێشابێ، کەواتە لەو جۆرە حاڵەتە، ئەو مەبەستانەی کەژیانی هاوسەرایەتی پیانەوە بەندە بەفیڕۆ دەچێت. چونکە لەبنەڕەتدا هاوسـەرایەتی بۆ بەیەکەوە ژیانی ئاسودەیی و خۆشەویستی دامەزراوە. هـەموو زانا موسوڵمانەکانیش لەسەر ئـەوە کـۆك بوونـە کەپیاو مافی تەڵاق دانی ژنەکەی هەیە. ئەگەر هۆکارێکی ڕەوا بۆ تەڵاق دانەکە لەئارا دابوو.

## کۆت و پێوەندەکانی تەڵاق دان

لەڕاستیدا تەڵاق دان شتێکی خراپـەو دژ بەویست و خواستی مرۆڤایەتییە، چونکە نابێت ژنەکەی خۆی تـەڵاق بدات تەنیا ئەگەر ناڕێکی و نەگونجان کەوتە نێوانیانەوە بـەجۆرێك لەگـەڵ یـەکتر هەڵنەکـەن و لەتـەڵاق دان زیـاتر ڕێگایـەکی دیکە شك نەبەن، دەنا تەڵاق دان حەرامـەو دژ بـەڕای گشـتییە، بێگومـان تـەڵاق زۆر لایـەنی خراپـی لێ دەبێتـەوە بۆیـە خـودای گـەورە بـەم جـۆرە باسـی هاوسەرایەتی لەقورئانی پیرۆزدا کردووە:(ومن آیاتـه أن خلق لكمْ منْ انفسكم ازواجا لتسكنوا الیها وجعل بینكم مودة ورحمة)الروم/٢١. خودای گەورە هاوسەرایەتی بۆ مـرۆڤ دانـاوە بـۆ ئـەوەی خۆشەویسـتیی و بـەزەییان بەیەکدابێتـەوەو لەگـەڵ یـەکدی بەئاسـودەیی بژیـن. لەفەرموودەکانی پێغەمبەریش جەخت لەسەر ئەوە کراوە





کەتەڵاق دان بێ هۆکارێکی نامرۆڤانەیە بۆیە فەرموویەتی (ابغض الحلال الی ا لله الطلاق).

یاســای هاوســەرایەتی لەپێناوی بەردەوامی پەیوەندی مرۆڤایەتی دانــدراوە بــۆ ئــەوەی هاوڕەگــەزی مــرۆڤ بەردەوام بێت و وەچەی لێ بکەوێتەوە. کەچی تــەڵاق دان پووچــەڵ کردنــەوەی ئــەو بەرژەوەندیەیــە زیــان بەهاوســەرەکان خۆیــان و بەکۆمــەڵی مرۆڤایــەتیش دەگەیــەنێ بۆیــە پێغەمبــەر (ﷺ) بەموســوڵمانانی ڕاگەیاندووە، کەخودای گەورە ڕقی لەتەڵاق دانەو تەنیا ڕێگای بەتەڵاق دان داوە ئەویش لەکاتی زۆر پێویستی، وەکو دەفەرمووێ:(ولا تطلقوا فان ا لله لایحب الذواقین والذواقات)رواه حاکم. واتە ژن تــەڵاق مــەدەن خودا ئەو ژن و پیاوانەی خۆش ناوێت وەختی (تحلل)ن- واتا ئەو کاتەی پیاوێك ژنی خۆی تەڵاق بدا نابێ مارەی بکاتەوە هەتا مێردێکی دیکە دەکاتەوە دەبێ لەگەڵیدا جووت بێ و پاشان تەڵاقی بداتەوە.

## تەڵاق دان بەدەست پیاوە یان ژن؟

لەهەندێ باروزروفی تایبەتیدا ژن زەرەرمەند دەبێ ئەگــەر ئــەو بــارەی تیایــەتی کەخراپیشەو پێچەوانــەی بەرژەوەندیەکانیەتی بەردەوام بێت. وەکو بزربوونی پیاو یان حوکمدرانی بۆ بەند کردن بۆ ماوەیەکی زۆر، یان پیاوەکــە تووشــی نەخۆشــیەکی درێژخایــەن بێــت چاوەڕوانی چاك بوونــەوەی لێ نــەکرێت، یــان پیاوەکــە نەتوانێ یان لەدەسەڵاتیدا نەبێ پارەو پوول لەژنەکــەی خەرج بکات، یان هەڵس و کەوتی پیاوەکە لەگەڵ ژنەکەی خراپ بێت بەجۆرێك نــەتوانن لەگــەڵ یــەکدی هەڵبکــەن و بژیــن یــان پیاوەکــە نــەزۆرك بێــت بــەراپۆرتی نــوژداری تایبەت ئەو نەزۆکیە بسەلمێنرێ. لەبەر ئەو هۆیانەو هی دیکەش ئەگەر ژن مافی داواکردنی تــەڵاق دانــی نــەبێت، ڕووبــەڕووی چەوســاندنەوەیەکی یــەکجار زۆر دەبێتــەوە. هــەر بۆیــەش شــەریعەتی ئیسلامی دەسەڵاتی داوا کردنی تــەڵاقی بــەژنان ڕەوا بینیــوە. هــەروەها وەکــو ڕێککــەوتن لەسەر ئارەزووی هەردوولایاندا بوەستێ وەکو ڕێککــەوتن لەســەر ترازانــی پــەیوەندی هاوســەرایەتی، بــەجۆرێك مافەکان پارێزراو بن بەپێی شەرع و یاساو ڕاستیخوازی تێدا ڕەچاو بکرێت. شــەریعەتی ئیسلامی دانی بەتــەڵاق دان دانــاوە وەکــو مــافێکی سروشــتی و بــەپیاوی داوە هاوشان لەگەڵ ئەرکەکانیدا بەرامبەر بەژن و منداڵــەکانیدا ڕێك بکەوێت، چونکە مارەییدان لەئەستۆی پیاوەو دەبێ بژێوی خێزان و منداڵەکانی دابین بکات. کەواتە شتێکی ئاســان نیە پیــاو دەست بــەرداری بەرژەوەندییــەکانی خــاوو خێزانەکــەی بێت، بۆیــە دواهێنــان بەپــەیوەندی هاوسەرایەتی لەدەست پیاوە ئەویش بەپێی ڕێسای (الغنم بالعزم)ی یاسای شارستانی عیراقیدا، بۆیە پیاو کاتێك ئــەو مافــەی دەخاتــە کــار واتــە مــافی تــەڵاق دان وەکــوو چارەیەك و هیچ ڕێگایــەکی دیکەی لــەپێشدا نــەبێت جگە لەتەڵاق دان. ژنیش لەمافەکانی خۆی بێ بەش نەکراوە. وەکــو داوا کردنــی تــەڵاق لــەدادگای شــەرعیەوە کــاتێك زەرەرو زیان بەبەرژەوەندیەکانی دەکەوێت. لەماددەی ٤٥ یاسای باری کەسیدا هاتووە:

١- ژن بــۆی هەیــە داوا بــەرز بکاتــەوەو تیــایدا داوای لەیــەك جیا بوونــەوە لەمێردەکــەی بکات لــەم دوو بارانــەی خوارەوە:

أ- پــارەو پــوول خــەرج نــەکردنی پیــاو لەژنەکــەی بــەبێ هۆیەکی ڕەوا دوای ماوەدانی بۆ ماوەی شەست ڕۆژ.

ب- لەبەر هۆی بزربوون و ون بوون و بێ سەروشوێن بوون یان حوکم بوون بۆ ماوەی زیاتر لەساڵێك مێردەکە خەرجی لێ وەرنەگیرێت.

٢- لێك جیاکردنەوە لەلایەن قازیەوە بەتەڵاقی گەڕاوە (رجعی) دادەنــرێ. پیــاویش لەتــەڵاق داندا سەربەســت نییەو چۆنی بوێت وا بکات، بەڵکو ڕێ و شوێنی تایبەتی بۆ دانراوە وەکو لــەقورئانی پــیرۆزدا ئامــاژەی بــۆ کــراوە (واللاتــی تخــافون نشــوزهن فعضوهــن واهجرواهــن فی المضاجع واضربوهن فأن اطعنکم فلا تبغوا علیهن سبیلا ان الله علیما کبیرا) سورة النساء/٣٤، واتــە ئــەو ژنانــەی مەترسی ئەوەیان لێدەکەن بەگوێتان نەکەن و گوێڕایەڵتان نەبن، ئەوە ئامۆژگاریــان بکــەن، کەســێ پلــەی دانــاوە بــۆ هەڵس و کەوت کردن لەگەڵیاندا واتا ئامۆژگاریــان بکــەن و ئەگــەر ســوودی نــەبوو لەگــەڵیان مەخــەون ئەگــەر هــەر



سوودی نەبوو لێیان بدەن بەجۆرێك ئازاریان پێ نەگات، بەڵام ئەگەر بەگوێیان کردن ئەوا رووشکێنیان مەکەن و بەسەریاندا مەچوون.

بەشێکی زۆر لەزانا موسوڵمانەکان لەسەر ئەو رایەن کەتەڵاق دان لەچوارچێوەی پێویستی بەدەرنییە، کەواتە بەپێی ئەو رایە نابێ تەڵاق بخرێت ئەگەر هۆیەکی زۆر گرنگ لەئارادا نەبێت، کاتێ ژنەکە ئازاری مێردەکەی یان هاوسێکانی بەقسەو کردەوەی خراپ دەدات، یان بەدرەوشت بێت کەواتە بەپێی ئەو ئایەتە پیرۆزە (فان اطعنکم فلا تبغوا علیهن سبیلا) نابێت پیاوەکان دژ بەژنەکانیان کەرێك و پێکن لەکارو کردەوەکانیاندا و رێگای راستیان گرتۆتە بەر، کاری خراپ ئەنجام بدەن وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ما احل الله شیئاً ابغض من الطلاق)ابو داود. کەواتە تەڵاق دان بەبێ هۆیەکی شەرعی و رەوا، ئازاردانە. ئەوەش قەدەغەیە لەئیسلامەتیدا. قورئانی پیرۆز رێگای رێککەوتن و پێکهاتنی لەنێوان ژن و پیاو داناوە. کەبەباشترین رێگا دادەنرێ بۆ رێکخستنی کۆمەڵایەتی لەچوارچێوەی خێزاندا، کاتێك مەترسی هەبێت پەیوەندیەکانی ئەو خێزانە بپچڕێ و ژیان و کەرامەتی ئافرەت بکەوێتە مەترسیەوە بۆیە لەقورئانی پیرۆزدا جەخت لەسەر رێککەوتن و نەپچڕاندنی شیرازەی هاوسەرایەتی کراوە لەپێناوی بەرژەوەندی هەردوولایە لەوەش گرنگتر بەرژەوەندی منداڵەکانیان. چونکە بۆی هەبە پیاو لەرق و کینەکەیدا بەرامبەر بەژنەکەی بەهەڵەدا چوو بێ وەکو لەقورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بۆ کراوە (وعاشروهن بالمعروف، فان کرهتموهن فعسی ان تکرهوا شیئاً ویجعل الله فیه خیراً کثیراً)سورة النساء/١٩.

## ناوبژیوانی کردن (التحکیم)

ئەو کاتەی ناڕێکی و ناهەڵی باڵی بەسەر خێزانێکدا دەکێشێ، هەردوو لا کەم و کورتی و کەم تەرخەمی دەخاتە ئەستۆی ئەویدیکە بۆیە لەقورئانی پیرۆزدا داوای کردووە بۆ وەلا نانی ئەو زیانەی لەئەنجامی دووبەرەکی نێوان هەردوو هاوسەر پەیدا بووە وەکو قورئان فەرمانی داوە:

وان خفتم شقاق بینهما فابعثوا حکما من اهله وحکماً من اهلها)سورة النساء/٣٥.

هەر لایەنێکی خێرخواز بەو ناوبژیوانی کردنە هەڵسێ باشە بەڵام لەخزم و کەسی خۆیان بێ باشترە. چونکە ئەوان زیاتر شارەزای گیروگرفتەکانیانن، هەروەها سەرپۆشی نهێنیەکانیان دەبن و نایەڵن ناوبانگیان لەناو خەڵکدا بزرێ، و بەزەیشیان بەمنداڵەکانیاندا دێتەوە. چاوەڕوانی سەرکەوتنی ئەو کارەی پێیان سپێردراوە پتر لێ دەکرێ، چونکە بەدڵسۆزی خەریکی ناوبژی کردن دەبن، دوای ئەوەی هەردوو ناوبژیوان بەراپۆرتێکی تێروتەسەل کاکڵەی گیروگرفتەکانی هەردوولا دیاری دەکەن، رادەی کەم و کورتی هەردوولا ئاشکرا دەکەن. ئەگەر هەوڵەکان بۆ رێکخستنەوەیان سەرنەکەوتن ئەوە بێ چارە دەبێ لێك جیاببنەوە کەخودای گەورە تەڵاق دان و لێك جیابوونەوەی پێ ناخۆشە، تەڵاق دان کەعیددەی بەسەر نەچووە (رەجعیە) دەکرێ ژیانی هاوسەریە سەرلەنوێ دەست پێبکاتەوە. بەڵام ئەگەر تەڵاق دانەکە عیددەی بەسەر چوو کەسێ مانگە ئەوە دەبێتە جیاکەرەوەی بچووك (بینونة صغری) ئەگەر پیاوەکە بیەوێ ژنەکەی بگەڕێنێتەوە لای خۆی دەبێ سەرلەنوێ مارەی بکاتەوە بەگرێبەندێکی تازەو مارەیشی بداتێ، بەڵام دوای ئەوە ئەگەر دیسان ئاژاوەی باڵی بەسەر پەیوەندی نێوانیان داکێشایەوە دەبێ مێردەکەی هەموو رێگاکانی کەپێویستە بۆ هێنانەهۆشی ژنەکەی و گەڕاندنەوەی بۆ ماڵی هاوسەرایەتی بخاتە کار بەڵام ئەگەر هەموو هەوڵ و کۆششەکانی بەفیڕۆ چوون ئەوە بۆی هەیە بۆ جاری دووەم ژنەکەی تەڵاق بداتەوە بەڵام ئەگەر هەروا بۆ جاری سێیەم تەڵاقی بدات ئەوە بەهیچ شێوەیەك ناتوانێ ژنەکەی بگەڕێنێتەوە لای خۆی، چونکە تەڵاق دانی کۆتاییەکە ئەم حوکمانەی هەیە:

١- نابێت ژنەکەی لەماڵی مێردەکەی بمێنێتەوە چونکە دەبێتە جیاکەرەوەی گەورە (بینونة کبری) لێك حەرام دەبن.

٢- نابێت ژنەکە بگەڕێتەوە ماڵی مێردەکەی چونکە جیاکەرەوەی گەورە بەگرێبەندو مارەیی تازەش هەر نابێت.





٣- ژنەکە دوای بەسەرچوونی عیددەی بۆی هەیە شوو بەپیاوێکی دیکە بکاتەوە.

دەکرێ ژنەکە بەو مەرجانەی خوارەوە بگەڕێتەوە لای مێردەکەی:

١- دەبێ شوو بەپیاوێکی دیکە بکاتەوە شووکردنێکی سروشتی و شەرعی

٢- دەبێ مێردەکەی تازەی بەپێی شەرع لەگەڵی جووت بێت.

٣- دەبێ لەگەڵ مێردەکەی دووەم یان بەمردن یان بەتەلاق دان لێك جیاببنەوە.

٤- دەبێ عیددەی بەسەر بچێ دوای ئەو لێك جیابوونەوەیە.

ئەگەر هاتوو ئەو مەرجانەی لەسەرەوە باسمان کرد لێی هاتەدی و هەردوولا ئارەزووی گەڕاندنەوەیان هەبێ دەکرێ مێردی یەکەم ژنە تەلاق دراوەکەی خۆی بەگرێبەندو مارەیی تازەوە بگەڕێنێتەوە لای خۆی.

مەرجەکانی تەلاق دان

١- ئەو کەسەی ژنەکەی تەلاق بدات دەبێ پێگەیشتوو (بالغ) بێت بەڵام ئەگەر نەبالغ بێ ئەوەدان بەتەلاق دانەکەی دانانرێ، چونکە تەلاق دان زیان بەتەلاق دەرەکەدەگەیەنێ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (کل طلاق جائز الاطلاق الصبي والمجنون) رواه النسائي، واتە هەموو تەلاق دانێك دەبێ تەنیا تەلاق دانی منداڵ و شێت نەبێ. چونکە تەلاق دان پێویستی بەهۆش و ئەقڵ هەیە، ئەوانەش لەمنداڵدا بەدی ناکرێن.

٢- پێویستە ئەو کەسەی ژنەکەی تەلاق بدات خاوەن ئەقڵ و کەمال بێت، کەواتە تەلاقی شێت ناکەوێت. چونکە ئەقڵ ئامێری بیرکردنەوەیە چونکە کەسانی شێت لەبنەڕەتەوە مەبەستیان نییە. تەلاق دانیش پشت بەمەبەست دەبەستێ.

شێت هەیە لەهەندی کاتدا ئەقڵمەندەو هەندێ کاتیش شێتە. لەو کاتانەی کەشێتاتیەکەی بەری دەدا ئەگەر ژنەکەی تەلاق بدا ئەوە تەلاقی دەکەوێ، هەروەها شێتۆکەو نووستوو و بێ هۆش و مەدهۆش (مەدهۆش ئەو کەسەیە لەبەر ترس و ماتەمین و توڕەییدا لەکردەوەو قسەکردندا تووشی نارێکی دەبێت)، یان ئەوانەی ئەقڵیان تێك دەچێ لەبەر تەمەن گەورەیی یان بەنەخۆشی یان کارەساتێکی ناکاو یان تووڕەبوونێکی توند. ئەگەر تەلاقی ژنەکانیان بدەن تەلاقیان ناکەوێ وەکو پێغەمبەر فەرمویەتی (لاطلاق في إغلاق)النسائي والحاكم. ئیغلاق ئەوەیە دەرگای مەبەست و ئیدراك لەسەر مرۆڤ دادەخرێت.

٣- ئەگەر کەسێك بکەوێتە ژێر پاڵەپەستۆی گەف و گوڕ بەکوشتن یان بڕینی یەکێك لەئەندامەکانی لەشی یان لەسەروەت و سامانی کەنەتوانێت بەیەکێك لەهۆیە ڕەوایەکان بەرگری لەخۆی بکات. لەو حاڵەتانەی باسمان کرد ئەگەر تەلاق دانی بەسەر زاری داهات ئەویش مەبەستی تەلاق دان نەبێ بەڵکو بۆ دورخستنەوەی ئەو ناڕەحەتیە بێ لەخۆی. بەم جۆرە تەلاقی ناکەوێت. چونکە جۆری هەڵبژاردن لەدەستی دەردەچێت وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (رفع عن امتي الخطأ والنسيان وماستكرهوا عليه)رواه المسلم. واتە ئوممەتی من بەرپرسیار نیە لەهەڵەو لەیاد چوون و بەزۆر کار پێ کردن، واتە لەرۆژی قیامەت سزا نادرێن.

## گاڵتەچی تەلاقی دەکەوێ:

مەرجی ئیمامیەکان بۆ تەلاق دان مەبەستە (نیەت) کەسێك ژنەکەی خۆی بەویستی خۆی تەلاق بدات تەلاقی دەکەوێت بەڵام کەسێك بەهەڵەیان بەگاڵتە ژنەکەی تەلاق بدات تەلاقی ناکەوێت. کەچی حەنەفیەکان و مالکیەکان و شافعیەکان و زەیدیەکان و ئەبازیەکان پێیان وایە تەلاق دانی بەگاڵتە دەکەوێ. ئەوانەش لەو بیروبۆچوونەیان دا پشت بەفەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەبەستن کەدەفەرکووێ:(ثلاث جدهن جد وهزلهن جد. النكاح. والطلاق. والعتاق)رواه الترمذي وابو داود. واتە سێ شت هەیە راستیەکەیان راستییە، گاڵتەکەشیان هەر راستییە. نیکاح و تەلاق دان و کۆیلە ئازاد کردن. کەوتنی تەلاق دانی بەگاڵتە بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە:

١) تەمبێ کردنی ئەو کەسەی گاڵتە بەشەریعەت دەکا.



٢) دەرگا داخستن بەرووی ئەو کەسانەی دوای تەڵاق دان پەشیمان دەبنەوە.

## نەخۆش بەنەخۆشی کوشندەو تەڵاق دان

نەخۆشی کوشندە ئەو نەخۆشییەیە لای زۆری نەخۆشەکە پێیەوە دەمرێ. و بەمردن کۆتایی دێ. وەکو کەسێکی حوکم دراو بەلەسێدارەدان. ئەگەر حوکمەکەی لەسەری جێبەجێ کرا، یا لەبارێکی وادا بێت هیچ ئومێدی ژیانی نەبێت. زانا موسوڵمانەکان رایان وایە ژنی تەڵاق دراو لەلایەن پیاوێك نەخۆشی کوشندەی هەبێت، دیارە مەبەستەکەی خراپەکارییەو زیان گەیاندنە بەژنەکەی بۆ ئەوەی لەمیراتەکەی خۆی بێ بەشی بکات. حەنەفیەکان رایان وایە ئەگەر ژنە تەڵاق دراوەکە لەکاتی عیددە دابێ هەر بەهاوسەری دادەنرێ چونکە پەیوەندی یەکجارەکی بەمێردەکەیەوە نەبڕاوە. هەروەها ئەگەر تەڵاق دانەکەی لەرادەی جیاکەرەوەش بێت میراتی لێ دەگرێ وەکو سزایەك بۆ پیاوەکە، چونکە تاوانی زیان گەیاندنی بەژنەکەی دەدرێتە پاڵ، لەبەرئەوەی مەبەستی خراپەیە (مەبەستی خراپەش بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە) هەر بۆیەش ئەگەر ژنەکەی عیددەشی بەسەر چووبێ ئەوە هەر میراتی لێ دەگرێ. بەڕای مالکیەکان هەر بەشووکردنیش ئەو مافەی ژنەکە نافەوتێ. کەواتە مافی ژنە تەڵاق دراوەکە لەمیرات گرتندا دەمێنێ، هەتا ئەگەر بەراستی تەڵاقیشی کەوتبێ لەیاسای باری کەسیدا لەماددەی ٣٥ ٢دا هاتووە: ئەوانەی لەخوارەوە ئاماژەیان بۆ کراوە تەڵاقیان ناکەوێ:

٢- ئەوەی نەخۆشی کوشندەی لێ بێت، یا لەبارێکی وادا بێت هی وەکو ئەو ئومێدی مردنی لێ بکرێت لەو نەخۆشیەو لەو بارەی تیایەتی. ژنەکەشی میراتی لێ دەگرێ.

کەواتە بەپێی ئەو دەقە تەڵاقی نەخۆش بەنەخۆشیەکی کوشندە بەشێوەیەکی رەها ناکەوێت. ئەگەر هەستو هۆشی تەواویشی هەبێت یان نەیبێت.

لەکۆتاییدا تەڵاق دان لەکاتی پێویستی نەبێ رێگای پێنەدراوە. خودای گەورە تەڵاق دانی ترنجاندۆتە چوارچێوەیەکی زۆر تەسك، کۆت و پێوەندی زۆری لەبەردەم کردۆتە کۆسپ، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی دەیەوێ ژنەکەی تەڵاق بدات باش بیر بکاتەوە زۆر بەهێمنی و هۆشمەندانە بڕیارێکی پڕ دڵنیا بوون بدات. چونکە تێك دانی ژیانی هاوسەرایەتی شتێکی ئاسان نییە. ژیانی هاوسەرایەتیش لەلای یاسادانەری گەورە شتێکی زۆر پیرۆزە بەبێ هۆیەکی پێویست نابێت لێك بترازێ. ئیسلام رێگای بەتەڵاق دان داوە ئەگەرچی بەشتێکی زۆر خراپ چارەسەرێکی ناشایستەی بۆ ژیانی هاوسەرایەتی داناوە. ئەگەر ژیانی هاوسەرایەتی تاریك بێت هیچ رووناکییەکی تێدا نەمێنێ ئا لەو کاتەدا ترازانی ئەو پەیوەندیە هاوسەرایەتیەو لێك جیابوونەوەو تەڵاق دان باشترە.

شەریعەتی ئیسلامی مافی بەئافرەت داوە داوای تەڵاق لەدادگا بکات ئەگەر هۆی پێویست لەگۆڕێدا هەبێ. لەهەمان کاتدا ئەو مافەش بەیەك لایەنی بەپیاو دراوە. وەکو لەماددەی ١/٣٩ یاسای باری کەسیدا هاتووە: (ئەوەی تەڵاقی بوێ دەبێ داوا بۆ دادگای باری کەسی بەرز بکاتەوە بۆ خستنی تەڵاقەکەی و حوکمیشی پێ وەربگرێت، ئەگەر نەتوانێ سەر لەدادگا بدات، دەبێ تەڵاق دانەکەی لەدادگا لەماوەی عیددەدا تۆمار بکات).

تۆمارکردنی تەڵاق دان لەدادگا وەکو لەو ماددەیەی سەرەوەدا هاتووە، مانای ئەوە نییە کەنابێ لەدەرەوەی دادگا ژن تەڵاق بدرێ. بەڵام دەبێ شێوە رەسمیەکەی وەربگرێ بەتۆمار کردنی لەدادگای باری کەسی و بڕیاری پێ دەربکرێ و بەژنەکەش رابگەیەنرێ.


**سەرچاوەکان:**

١- الاحوال الشخصية في الفقة والقضاء والقانون - الدكتور - احمد عبيد الكبيسي.

٢- الفقة المقارن للاحوال الشخصية - بدران ابو العينين بدران

٣- مدى سلطان الارادة في الطلاق - الجزء الاول الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي.

٤- مدى سلطان الارادة في الطلاق - الجزء الثاني الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي.

٥- شرح قانون الاحوال الشخصية - المحامي محسن ناجي.





# دیاردەی (کوشتن بەبەزەیی)
# (Euthonaisa)
# لەنێوان شەریعەت و یاسادا

مافپەروەر / سەباح سیامەنسوری

لەجیهانی رۆژئاواو ئەمریکاو ئوستراليادا بەراشكاوی دیاردەیەکی سامناك و مەترسیدار سەری هەڵداوە کە ماوەیەکە پیاوانی یاساو دادوەرەکانی جیهان بە خۆیەوە خەریك کردووە، ئەمەش دیاردەی (کوشتن بەبەزەیی)یە Euthonaisa بەعەرەبیش پێی دەوترێ (القتل بالرحمة).

دیاردەی (کوشتن بەبەزەیی وەکو ئەوە وایە کە مرۆڤێك تووشی نائومێدی دەبێ لەچاکبوونی هاوسەرەکەی کە تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە، بۆیە تاکو لە ئێش و ئازاری نەخۆشیەکە رزگار بێ، دەیکوژێ لەوانەشە ئەنجامدانی ئەم کارە بەرەزامەندی ژنەکە بێ.

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات: ئایا مێردەکە بەبکوژ دادەنرێ؟ وەیان ئەو پزیشکە تاوانبار دەبێ کە ئەم کارە ئەنجام بدات؟ ئایا شەریعەت و یاسا چۆن سەیری ئەم دیاردەیە دەکەن؟

ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی فراوان دوای شەڕی جیهانی دووەم سەری هەڵدایەوە لەئەنجامی رووخانی هەموو داب و نەریتێکی کۆمەڵایەتی و فیکری و بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی و خراپەکاری و ترياك كێشان، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە بەکارهێنانی تەکنەلۆژيا بەجۆرێکی نامرۆڤانەو خراپ.

لەرووی مێژوويیەوە، ئەم دیاردەیە لەلایەن فەیلەسووفی بەناوبانگی گریکەکان (ئەفلاتون) پەسەند کراوە هەروەکو لەکتێبی سێیەمی لەنووسراوە بەناوبانگەکەی (الجمهورية)دا هاتووە، کە دەڵێ: (ئەوانەی کە نەخۆشی بێ چارەیی لەشيان هەیە، پێویستی پشتگوێ بخرێن تاوەکوو دەمرن).

لەسەدەی سیازدەهەمی زایینیدا فەیلەسووفی ئینگلیزی قەشە (بیکۆن) Becon (١٢١٤-١٢٩٤) ئەم کارەی پەسەند کردووە، فەیلەسووفی ئەڵمانی (فردريك نيتشه) پشتگیری لەکاری لەناوبردنی نەخۆشەکان کردووە بۆیە دواجار ئەم هەڵوێستە کاری کردە سەر بیرو بۆچوونی هیتلەر کە بەیاسایەکی پەسەند کراو لەلایەن (رایخشتاخ)وە (٢٧٥)هەزار مرۆڤ کوژران لەساڵی ١٩٤٠ تا کۆتایی شەڕەکە.

## هەڵوێستی ئايينەکان:

١- ئایینی جوولەکە: ئایینی جوولەکە هەموو جۆرە کوشتنێکی قەدەغە کردووە کە لە (الوصايا العشرة)دا هاتووە.



٢- ئایینی مەسیحی:

أ- مەزهەبی کاتۆلیك: ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی هەموو جۆرە کوشتنی قەدەغە کردووە، لەئینجیلدا هاتووە (کوشتنی مرۆڤی بێ گوناه دەستدرێژی کردنە سەر مافی خودا).

ب- مەزهەبی پرۆتستانت: ئەمانە هەڵوێستی مام ناوەندیان هەیە لەم دیاردەیە، کە سەرۆکی ئەساقیفەی _کەنتربری) لەساڵی ١٩٣٦ لەئەنجومەنی لۆردانی بەریتانیا ئەم کارەی پەسەند کرد.

هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلامی: لەبەر ئەوەی کوشتن گەورەترین تاوانە، بۆیە ئایینی ئیسلام هەڵوێستێکی روون و ئاشکرای هەیە دەربارەی کوشتن (القتل) ئەوەش لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

١) ولا تقتلوا النفس التي حرم الله الا بالحق.(سورة الاسراء/٣٣).

٢) ومن قتل مؤمناً متعمداً فجزاؤه جهنم خالداً فيها(سورة النساء/٩٣).

بۆیە لێرەدا (ولاتقتلوا النفس التي حرم الله) واتە ئەو کەسە مەکوژن کەخودا حەرامی کوشتنی کردووە تەنیا لە سەر حەق نەبێ واتە ئەگەر تاوانی کردبێ وەیان کەسێکی دیکەی بەدەستی (ئەنقەست) کوشتبێ، ئەوەش بەپێی (نص)ی قورئان و سوونەت کە شەریعەتی ئیسلام سەرچاوەکەی لەو وەردەگرێ.

٣- قد خسر الذين قتلوا اولادهم سفها بغير علم/الأنعام١٤٠.

٤- واذا الموءودة سئلت، بأي ذنب قتلت/التكوير٨،٩.

٥- يا ايها الذين آمنوا كتب عليكم القصاص في القتلى الحر بالحر والعبد بالعبد والأنثى بالأنثى../البقرة١٧٨.

لەم ئایەتانەی سەرەوە بەتەواوی بۆمان روون دەبێتەوە کە ئایینی ئیسلام چەندە رێزی لەمرۆڤ گرتووەو دەگرێ بەگشتی وە لەمرۆڤی ئیماندار بەتایبەتی لەئایەتی یەکەمدا باسی (نفس) دەکات واتە هەموو (نفس)ێك بەبێ جیاوازی لەنێوان ئیماندار و نائیماندار واتە حورمەتی مرۆڤی غەیرە موسوڵمانیش دەگرێ.

لەئایەتی دووەمدا تخصيص)ی تێدایە (من قتل مؤمناً متعمداً) لێرەدا باس لەکوشتنی ئیماندار دەکات بە ئەنقەست.

* کوشتنی بەئەنقەست (القتل العمد): کردەوەیەکە لەلایەن مرۆڤەوە کە لەرێگای ئەم کردەوەیە بیەوێت ژیانی مرۆڤێکی تر لەناوبەرێ، بەبێ حەق، ببێتە هۆی مردنی.

بۆیە لێرەدا بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام (کوشتن بەبەزەیی) بە (القتل العمد) دادەنرێ، لەبەر ئەوە کوشتنەکە (سبق الاصرار)ی تێدایە واتە کوشتنەکە (غير عمد)ی نییە.

هێندە (یاسا) هەیە ئەم کارە بە (کوشتنی بەئەنقەست) لەقەڵەم دەدا، وەکو یاسای دەوڵەتی سوریا، بەڵام هێندە (یاسا)ش هەبووە بەکارێکی ئاسایی داناوە وەکە لەپێشەکی باسمان کرد، وە لەم دواییەدا پەرلەمانی هەرێمی باکووری ئوستراليا ئەم جۆرە تاوانەی پەسەند کردبوو بۆیە دووبەرەکییەکی گەورەی لەکۆمەڵگای ئوسترالی دروست کردبوو، لەدواییدا ئەم یاسایە پووچەڵ کرا.

ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێ کە شەریعەتی ئیسلامی بەبێ یەك و دوو هەموو جۆرە کوشتنێکی حەرام و قەدەغە کردووە، وە ئەو پایەیەی کە شەریعەتی ئیسلامی بەمرۆڤی داوە زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ (یاسا)کە دەستکردی مرۆڤە وەیان دەستکردی کۆمەڵە مرۆڤێکە، لەبەر ئەوە هەر یاسایەك کە مرۆڤ دایدەڕێژێ بەپێی بەرژەوەندی (چینایەتی و کۆمەڵایەتیو رامیاری) خۆی دەبێ باشترین بەڵگەش یاساکانی (ئەڵمانیای نازی) بوون کە هەزاران دوژمنانی خۆیان بەو هەنجەتە لەناوبرد.

---

تێبینی: سوودم لە نووسینی (کوشتن بەبەزەیی) وەرگرتووە کە لەژمارە (٣)ی (یاسا پارێزی)دا بڵاوم کردبوەوە.





# ئایینی ئیسلام و...

# پەیڕەوکردنی یەکسانیو..

# مافی مرۆڤ

ئامادەکردنی: ئەحمەد سۆفی مستەفا

وەك لەبەندی یەکەمی جاری گەردوونی مافی مرۆڤدا هاتووە کە دەڵێت:(هەموو مرۆڤێك بەئازادی لەدایك دەبن و یەکسانن لەنرخ و بایەو مافدا، هەر هەمووشیان عەقڵو ویژدانیان لەخوای گەورەوە پێ دراوە، بۆیە دەبێت بەگیانێکی تەبایی‌و برایانەوە رەفتار لەگەڵ یەکدا بکەن). هەروەها لەبەندی هەژدەیەم و بیست و یەکەمدا دەڵێت (هەموو کەسێك مافی ئازادی بیرکردنەوەو رادەربڕین و ویژدانیو ئایینی هەیە، جگە لەوانەش مافی بیمەی کۆمەڵایەتی هەیەو بەگوێرەی دەستوورو یاسای هەر دەوڵەتو نەتەوەیەك، دەبێت مافی ئابووریو کۆمەڵایەتیو ئایینیو فەرهەنگیو ئازادیو کەسایەتی دابین بکرێت).

دوای ئەوەی نوێنەرایەتی ئەنجومەنی نەتەوەیی لەساڵی (١٧٨٩)ی زایینیدا لەفەرەنسا کۆبوونەوەو لەئاکامدا گەیشتنە ئەو بڕواو قەناعەتەی کە پشت گوێ خستنی یەکسانیو مافی مرۆڤو دادی کۆمەڵایەتیو کەمتەرخەمی کردن لێیان، هۆکارێکی پڕەنسیپی بەدبەختی گشتیو فەسادی کەسایەتیو ئیداری حکومەتەکان دەبینن بۆیە دەرەنجام بڕیاریاندا (مافە سروشتیە پیرۆزەکانی مرۆڤو مرۆڤایەتی) لەراگەیاندنێکی بەربلاوە رەسمیدا دیاری بکەنو تیایدا پێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤ بکاتە بن بەست، هەر بەم هۆیەشەوە ئەنجومەنی نەتەوەیی فەرەنسا مافەکانی هاونیشتمانیانی بەتێکڕای دەنگ پەسەند کردو رایگەیاند کە ئەم جاڕدای مافە، بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم تا کۆتایی جەنگی گیتی یەکەم، بکرێتە مەکۆی بزووتنەوە رامیارییە کۆمەڵایەتیو ئایینیەکان دژ بە چەوساندنەوەی مرۆڤ و دیکتاتۆریەتو تاکڕەوی لەهەر چوارکیشوەری ئەمریکاو ئەورووپاو ئاسیاو ئەفریقیادا کە دەبێتە هۆی دانانی بنەمای ژیانی دیموکراسی نوێ لە جیهاندا...

هەروەکو روون و ئاشکرایشە ئازادی مرۆڤو نەتەوەو پاراستنی کەرامەتی، فاکتەرێکی گرنگە لەپرەنسیپە سەرەکیەکانی سیستەمی جیهانی نوێ. چونکە مرۆڤ خۆی لەخۆیدا گەورەترین سەرمایەیە، ئەگەر بێتو تەواوی ئازادیو ئارامیو مافەکانی بدرێتێ ئەوە بەرەو لوتکەی ئەمریو پێشکەوتنی زانستیو ئایینیو کۆمەڵایەتیو رامیاریو فەرهەنگی هەنگاوان داژوێو لێیان جودا نابێتەوە، خۆ گەر نا بەرەو نشێوی ئاشووب و چەواشەبوون مل دەنێو کەسیەتی خۆی لەدەست دەدات و رووبەرووی سەرجەم پێشێلکاریەکان و چەوساندنەوە دەبێتەوە.

بێگومان ئادەمیزاد لەنێوان گرفتەکانی جیهاندا، کە پڕیەتی لەجیاوازی راو بۆچوونی سیاسیو ئایینیو ئابووریو کۆمەڵایەتی، پێویستی بە شوناسنامەی مرۆڤایەتیو پاراستنی مافەکانی لەنێو



کۆمەڵوکۆمەڵگای بەشەریەتدا هەیە. هەروەك لەفەلسەفەی ئەفلاتۆندا باس لەوە دەکرێت کە مرۆڤ دەبێت مافی بپارێزرێت لەلایەن فەرمانداڕانی دەوڵەتەکەیانەوە، ئەمانەو لەساڵی (٥١٢)ی زایینیشدا (کارا کالا) یاسایەکی بنەڕەتی دانا کە تیایدا (یەکسانی نێوان میللەتانی جیهانی دیاری کردو لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیادا کەوتە دووبەرەکیو ململانێیەکی چڕ).. هەروەها لەکۆمەڵگای ئیسلامیشدا باس لەڕێزگرتنی قیەم و نەخلاقیەتی ئادەمیزادەکان کراوەو دەکرێ ئەگەرچی ئایینی مەسیح لەڕۆمانیادا، هەندێك نەریتی بۆ خۆی پیادە کرد، بەڵام بڕیاری لەسەر مافەکانی مرۆڤو یەکسانی و سزاو پاداشتو چاکەداو کاریشی پێکرد.

ئەوەی لێرەدا کرۆکی باسەکەمانە دەمانەوێ تیشکێك لەخۆری ئیسلامەوە بخەینە سەر ﴿ئایینی ئیسلام و پەیڕەوکردنی یەکسانیو دادی کۆمەڵایەتیو سەرجەم مافەکانی مرۆڤ﴾ بە (٣) قۆناغ ناوزەد دەکرێتو تیایدا دەتوانرێت دەوڵەتەکانی عەرەبی ئیسلامی لەسێ سەردەمدا دیاری بکرێن لەوانە:

أ/ حوکمی ئیسلامی.

ب/ حوکمی عوسمانی.

ج/ حوکمی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا.

ئاشکرایە لەدەوڵەتە ئیسلامیەکاندا، مافە یەکسانی (مرۆڤ بۆ مرۆڤ) هەر لەسەرەتای لەدایك بوونی ئایینی ئیسلامی پیرۆزەوە هەبووەو بەڵگەشمان بۆ ڕاستی ئەم ووتەیە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزو دەیان فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەری موسڵمانان حەزرەتی محەمەد د.خ) وەك:

* إنما المؤمنون اخوة/ الحجرات: ١٠

* لا فرق بين العرب والأعجم إلا بالتقوى/ رواه مسلم.

* ان الله يأمر بالعدل والاحسان... النحل: ٩٠.

* واذا حكمتم بين الناس .../ النساء: ٥٨.

ئەمانەو زۆری تریش لەئایەت و فەرموودەی پێغەمبەران لەسەر مێژووی جاری جیهانی ئیسلامیو پیادەکردنی مافی مرۆڤو یەکسانی لەنێوان موسڵماناندا ئەمەو ئەو ڕۆڵە کاریگەرو گرنگەی کە دەوڵەت لەسەریەتی جێبەجێی بکات سەبارەت بە چاککردنی ژیان و گوزەرانی هاووڵاتیانی موسڵمان، لەڕێگای دەزگاکانی حوکمەوە، دەبێت بزانن چۆن (دەسەڵات و یاسا) بەسەر دەستەجەمعی خەڵکیدا دەسەپێنن؟ دیارە ئەم بەرنامەیەش لە دنیای ویژدانی خەڵك خۆی و حوکمڕانانی دەوڵەتەکانەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، دادو مافو یەکسانی مرۆڤەکان پیادە کراوەو لەهەموو بوارێکی فکریو زانستیو ڕۆشنبیریو ئایینیو ئەخلاقیو فەلسەفیدا، پەرەی سەندووەو پەرە دەسەێنێ.

جا لەو پێودانگەوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە دانانی یاساو دەستووری بنەڕەتی ئایینیو کۆمەڵایەتی بۆ هەر ولاتێك، پەیوەستە بە ئەنجومەنی ڕاوێژکارو زانستی شورای ئیسلامیو پیادەبوونی مافی حوکمی ئەو دەوڵەتە خۆیو بەرجەستەکردنی (کۆدەسەڵاتی دیموکراتی)و شکاندنی قیودی گەردنی ئابووریو زانستیو ئایینیو فەرهەنگیو کۆمەڵایەتی لەنێو کۆمەڵو کۆمەڵگای مرۆڤدا.

---

**سەرچاوەکان:**


١- قورئانی پیرۆز.

٢- ڕاڤەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ).

٣- مافەکانی مرۆڤ / چاپی یەکەم: ١٩٩٦.

٤- حقوق الانسان في العراق: ١٩٩٠.

٥- ژمارە (١) بڵاوکراوەی دەنگی مرۆڤ.

٦- چەندین کتێب و بڵاوکراوەی ئایینی.

٧- تەفسیری خاڵ.



## ئاینی ئیسلام

# ئاینی باوەڕو شەریعەتە (١)

نووسینی: فاتح یاسین مودەڕیس

قورئانی پیرۆزو فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ موسوڵمانان یەکەم شیکردنەوەی ڕێسای باوەڕی ئیسلامەتین.. جا باوەڕ بوون بەخوداو بەپێغەمبەرو بەفەرموودەکانیان هەستو نەستێکی مرۆڤایەتین کەلەناخیانەوە هەڵدەقوڵێ و لەویژدانیان سەرهەڵدات بۆ ئەوەی لایەنی خێر زاڵ بێت بەسەر لایەنەکەی تردا، بەمەی کەهەمیشە هەست دەکەن پەروەردگاری جیهان دەیانبینێ و چاودێریان دەکات، لەدواڕۆژیش‌دا لەسەر هەر کردەوەیەك کەلەژیانیان‌دا کردوویانە حیسابیان لەگەڵ دەکات.

(نەتەوە – خاك– سوپا– یاسا– دادوەری) ئەم بەرهەڵستیانە لەکۆمەڵگەی موسڵمانی شاری مەککەی ئەوساکەدا لەماوەی (١٣) ساڵدا دەستەبەری بوونی باوەڕ نەبوو بوون، هەر بۆیەشە ئەو ئایەتە پیرۆزانەی کەلەشاری مەککەدا دابەزیون لەسەر باوەڕ بوونە، ئایەتە پیرۆزەکانیش ناونراون بە(مەککی) چونکە لەشاری مەککەی پیرۆزدا هاتوونەتە خوارێ.. بەڵام پاش کۆچ کردنی دواییان بۆ شاری مەدینە، باوەڕ خۆی سەپاندوو موسوڵمانەکان دەستەبەری بوون.. دوا بەدوای ئەمە، واتە لەشاری مەدینە ئایەتەکانی – تەکلیف– دابەزین بۆ ئەوەی جیتر موسڵمانان پێش کارێك بکەون وەکو ئەوەی کەلەپێش موسڵمان بوونیان کردبوویان.. بۆیە پێویست بوو لەسەر هەر موسڵمانێك، بۆ هەر کارێك بەر لەوەی ئەنجامی بدات دەبوو راوێژی بەپێغەمبەری خودا (ﷺ) بکردبایە، ئینجا لەسەر فرمایشتەکەی ئەو کارەکەی ئەنجام بدابایە، وە ئەم ئایەتە پیرۆزانەی کەلەشاری مەدینەش دابەزیون ناونراون بە(مەدەنی)، یان (مەدینی).

موسڵمانەکانی ئەمڕۆش هەمیشە بەبەردەوامی دەستیان بەباوەڕەکەیان گرتووە، سەرباری ئەو هێرشە نارەوایە هەمەچەشنانەی کەبەپلان و نەخشەیەکی دارێژراوەوە دەکرێنە سەریان لەلایەن دوژمنەکانیانەوە. کەچی موسڵمانەکان هەر کۆڵنەدەرو بەرخودان بووینە بەرامبەر بەباوەڕەکەیان و پاراستووشیانە.. بەڵام ئەوەی ئێمە لێرە ئاماژەی بۆ دەکەین ئەوەیە، کەئەوەی لەکۆمەڵگای ئیسلامەتی‌دا دەبینرێت. وەکو ئەوەی نیە کەلەئاینی ئیسلامی پیرۆزدا هەیە. چونکە (شەریعەتەکەیان) فەرامۆش کردووە.. سامان واتە (ماڵ) هیچ کاتێك بەم رێژەیە نەبووە تا هەژارو دەست کورت نەمێنێت. گەر بەم رێژەیەش نەبوو هەژارو دەست کورت دەبێت، گەر هەژارو



دەست کورتیش بوو، هەڵبەتە هۆکاری سەرەکی تاوان بۆ دزیو ڕێگریو ڕووتکردنەوە پەیدا دەبێت. لەگەڵ ئەوەش ئەم جۆرە تاوانکارانە حوکمی خودایان بەسەردا ناسەپێنرێت، چونکە گەر ئێمەی موسڵمان بمانەوێ حوکمی شەریعەتی خودا بەسەریان دابسەپێنین، هەڵبەتە ئەوکات پێویستیش دەبێت لەسەرمان حوکمی شەریعەتی سامانیش واتە (ماڵ) بەسەریاندا بسەپێنین بۆ وەدیهێنانی دادوەری حوکمی خودا لەهەردوو لاوە.. لەگەڵ ئەوەش کۆمەڵانێکی زۆریش هەن لەسەرمایەدارەکان نایانەوێت زەکاتی ماڵی خودا کە لەسەریان (فەرزە) لەماڵەکانیان دەربکەنو بیدەن بەهەژارانو دەست کورتان.

هەر بۆ ئەم مەبەستە مامۆستا هوێدی ئاماژەی بە(ئیبن حەزم) کردووە کەسنووری بۆ مافی سەرەکی موسڵمانان داناوە کەپێویستە بۆیان دەستەبەربکرێتو دەڵێت (پێویستە بۆ کەسی موسڵمان ماڵێك هەبێت کەتیایدا بحەوێتەوە- لەئازووقەی ژیانیشی پەکی نەکەوێت- جلو بەرگی هەند هەبێت کەهاوینەو زستانە بەشی بکات - گەر لەتواناش کەوتوو بوو پێویستی بەیارمەتی دەرێك بوو بۆ هاریکاری کردنی ئەوا دەبێت ئەویشی بۆ بەجێ بگەیەنرێت- تا گەر هاتوو پێویستی بەرژەوەندی لەسوار بوونی وڵاخێك دابوو دیسان دەبێت ئەویشی بۆ دەستەبەر بکرێت).. تا بەهیچ شێوەیەك هیچ موسڵمانێك لەژیانیدا پەکی نەکەوێت، تا بەتەواوی حوکمی شەریعەتی خودای لەهەردوو لاوە بەسەریدا بسەپێنرێت، نەك تەنیا لەتاوان کردنیدا.

باشە!.. ئایا ئەم مافانە تائێستا بۆ موسڵمان دەستەبەر کراون!؟.. هەڵبەتە هەرگیز دەڵێین نەخێر.. وە ئایا بوونو دەوری شەریعەت بۆ هەموو بوارەکانی ژیان وەکو یەك نیە..؟، هەر بۆیەشە ئەم شەریعەتە پیرۆزە دەستەبەری واتە کەفیلی موسڵمانانە لەمافو پەیام داریاندا.

خەلیفەی موسڵمانان ئەبوبەکری سدیق دەفەرموێت (سوێندم بەو خودایەی گەر قەدەغەم بکەن لەوەرگرتنی زەکاتی یەك ساڵ کەدەیهێنن بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەوە کوشتارم دەکرد).

بۆیە گەر هاتوو حوکمی شەریعەتی خودا تەنیا لەسەر سامان واتە (ماڵ)دا سەپێنرا بایە. ئەوکات مافی هەژارانو دەستکورت دەستەبەر دەبوون کێشەو گیروگرفت، تاوانو دزی. ڕێگرتنو ڕووتکردنەوەش نەدەما بەهۆی وەرگرتنی مافی خۆیان لە(ماڵ).. ئەمەش بەڵگە نەویستە، واتە بێ گومان هەر کۆمەڵگایەك کەئاسوودە بێت. کەمو کورتی ماڵی تێدا نەبێت. ئەوا بەرێژەیەکی زۆر زۆر کەم نەبێت، دەنا هیچ تاوانێکی تیادا نابێت.. بەتایبەتی لەکۆمەڵگایەکی ئیسلامیدا. چونکە ئاینی ئیسلام لەسەر گۆی زەمیندا ئاینی یەکسانیو دادوەریە.

هەروەها کەتاوانی (زینا)ش هەیە، ئەویش لەبەربوونی هۆی تایبەتی خۆیەتی. چونکە گەر بێت گەنجی موسڵمان پارەو پوولو جێگەو شوێنی پێویستی هەبێت، هەڵبەتە ئەوکات ژن دەهێنێت. سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەجێ دەگەیێنێت.. بەڵام گەر ماڵی نەبوو. یان ئەو مافەی پێ نەدرابوو ئەوکاتە چی بکات..؟؟؟

بۆیە ئەمڕۆ تەماشا دەکەین گەنجانێکی زۆر لەکۆمەڵگاکەمان دووچاری ژن نەهێنان بووینەتەوە، یاخود ژن هێنانیان دوا دەخەن.. هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی (ماڵ). یاخود دەگەڕێتەوە بۆ پێنەکرانی هەڵسووڕاندنی ژیانی خێزانەتیان، چونکە گوزەرانی



ژیان‌و پەیدا کردنی بژێو بۆتە کارێکی قورس‌و گران لەسەریان. بۆتە بەربەستێکی گەورە لەپێشیان..

یان گەر هاتوو حوکمی شەرعی خودا وەك یاسایەکانی تر بەسەر پۆشاکی شەرعی ئافرەتاندا سەپێنرا، هەڵبەت هۆکاری (زینا) کەم دەبێت‌و نامێنێت.. کەچی ئێمەی موسڵمان، هەمووان (واتە قورئان خوێنەکان) کاتێ قورئانی پیرۆز دەخوێنینەوە، ئایەتەکانی -حیجاب- بەرچاومان دەکەوێ دەشێ خوێنینەوەو گوێ بیستی دەبین، واتاکەشی فێر دەبین‌و دەیزانین، کەچی لەگەڵ ئەوەش بەسەریدا تێپەڕ دەبین، هەروەکو ئەوەی هەرگیز نەشمان خوێندبێتەوە -نەشمان بینی بێ - نەشمان بیستبێ- وایە. کەچی، رووت‌و خۆهەڵماڵیویش بەتازە مۆدەبیانەوە، بە-ئیغرای- گەنجانەوە لای ئافرەتانمان، رێگاو کۆڵان‌و ماڵ‌و بازاڕەکانیان پڕ کردووە. یان گەر فەرمانێکی رەسمی لەمیریەوە دەرچوو بەو دەقەی (کەلەسەر هەموو ئافرەتێك پێویستە کاتێ لەماڵ دەردەچێ دەبێت پۆشاکی شەرعی بپۆشێت ئەگینا بەم شێوەیە (     )پێی دەژمێردرێت، یان باوکی یان براکەی بەند دەکرێت یان....تد).

ئێستا روومان لەئێوە دەکەین‌و دەڵێین. ئایا پاش دەرچوونی ئەم فەرمانە، چۆن لەئافرەتان دەبینرا، لەوەی کەلەئێستاو پێشتر بینرایە..!؟

کەواتە مادامەکی ئێمەی موسڵمان دەستمان بەباوەڕەکەمان گرتووە، هیچمان بۆ نەماوەتەوە تەنیا ئەوە نەبێت کەحوکم بەشەریعەتی خودا بکەین، تا ببینە کۆمەڵگایەکی موسڵمانی تەواو، تاوەکو ئەوەی کەلەشەریعەتی خودا هەیە وابین.

خەلیفەی موسڵمانان عوسمانی کوڕی عەففان دەفەرموویت:(ان الله لیزع بالسلطان مالایزع بالقران)قول عثمان بن عفان.

بۆیە ئێمە لەم وتارەدا داوا لەموسڵمانانی خۆشەویست دەکەین کەبگەڕێنەوە لای شەریعەت‌و ئایینە پیرۆزەکەمان (ئاینی ئیسلام).. واتە کۆچ مەکەن لەکتێبی خودا (قورئانی پیرۆز)، فەرموودەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) فەراموش مەکەن.. بیر لەم فەرموودەیەی پەروەردگاری جیهانیش بکەنەوە کەدەفەرموویت (فلیحذر الذین یخالفون عن امره ان تصیبهم فتنة او یصیبهم عذاب الیم).النور٦٣.

هەروەها دژی کوفرو هاوتایی‌و نکوڵی کردنیش بوەستن، کەجیاوازی‌و ناکۆکی خستۆتە نێوانتانەوە، ریزەکانی پارچە پارچە کردوون، چڕنووکی لەکۆمەڵگاکەتانی گرتووە، ئاگاداری پلانی داگیرکەران‌و دوژمنانیش بن کەبۆتانی ئامادەکردووە، دەیەوێ یەککگرتنەکەتان تێك بدات، هێزەکەتان بێ هێز بکات، خوێنتان بمژێت، هەندێکتان لەپێش هەندێکتان ئاشرین بکات‌و بتان کاتە ناحەزی یەکتر.

بەم شێوەیە پشت بەپەروەدگاری جیهان دەبەستین بەئومێدی ئەوەین کەسوودێکمان گەیاندبێت، بەو هیوایەی کەپەروەدگار پاداشی هەموو لایەك بداتەوە.. بەم فەرموودەیەی خوای گەورەش کۆتایی بابەتەکەمان دەڕازێنینەوە کەخودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت:

(یا ایها الذین آمنوا لاتتخذوا الذین اتخذوا دینکم هزوا ولعبا من الذین اوتوا الکتاب من قبلکم والکفار اولیاء واتقوا الله ان کنتم مؤمنین)المائدة/٥٧.

صدق الله العظیم

---

**تێبینی:**

١) وشەی (شەریعەت) مانای (یاسا)و (قانوونە) بەلام بۆیە من لێرەدا (شەریعەت) وەکو خۆی بەکار هێناوە، چونکە زیتر واتای مەبەست دەبەخشێت



# ئافرەت پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام

ئا: سنەوبەر سابیر
ئەندامی مەكتەبی سكرتاریەتی ئافرەتانی كوردستان

ئافرەت پێش ١٤١٨ ساڵ لەمەوبەر زۆر بێ نرخ بووە... مێژوو دەیگێڕێتەوە بۆمان.. هەروەك كەلوپەل و ئاژەڵ لەبازارەكاندا كڕاون و فرۆشراون... دەتوانم بڵێم ئێستاش شوێنەواری ئەم دیاردەیە لەهەندێ ولاتاندا هەرماون.. هەروەها لەهەندێ ولاتانی جیهان لەژێر پەردەی سەربەستی و سەربەخۆیی دووچاری گیروگرفتی خۆیان كردوون بەبێ هیچ بنەمایەكی راستەقینە.. تووشی داوێن پیسان و سامان داران بوونەو بەهای گەنجێتیان ژاكاوە.. لەپاش بەساڵ چوونیانا.. دەكەونە سووچی بێ كەسی و بێ رێزیی یەوەو بێ مافی یەوەو بەئاهوو ناڵەی خۆیان نەتلێنەوەو دوائەنجام سەرنەنێتەوە..

ئەمەش جۆرێكی ترە لەكڕین و فرۆشتندا دەژمێرێ.. بەڵێ بۆ نمونەو زیاتر شارەزایی ئەم بابەتەمان..

١) ئەسینیەكان ئافرەتیان تەرخان كردبوو تەنها بۆ ژان و مناڵ بەخێوكردن.

٢) هندۆستەكان مردن و دۆزەخ و ژەهری مارو ئاگریان بەپەسەندتر دەزانی لەئافرەت.

٣) رێژەی بەزەیی بەئافرەتدا لەلای جوولەكەكان پتر نەبوو لەباری ژیانی ئافرەت.

٤) لەرۆما گەیشتنە ئەوەی كەئافرەت گیانلەبەرێكەو بەس.. مافی گۆشت خواردن و پێكەنینیان نەبووە تەنها دەبوایە كاتی خۆیان بەنوێژو خواپەرستی و مناڵ بەخێوكردنەوە بەرنەسەر.

٥) لەفەرەنساش لەساڵی ٥٨٧ز گەشتنە ئەوەی كەئافرەت ئادەمیزادە.. بەڵام دروست كراوە تەنها لەپێناوی حەسانەوەی پیاودا..

٦) لەئینگلتەراش (الامیر هنری الثامن) فەرمانی دەركرد كەئافرەت نابێ تەماشای (انجیل) بكات مافی جل و بەرگی نەبوو دەبوایە خۆی بۆ خۆی پەیدابكردایە..

هەرچەند ئافرەتیش لەناو كوردەواریدا بایەخێكی وای نەبووە.. ئافرەتی كوردیە پەچەو پەردەی نەبەستووە لەگەڵ پیاودا.. چۆتە كێڵگەو شاخ و داغ و ئاژەڵ بەخێوكردن و كە ئەمەش باری ژیانی ئافرەتی كوردی جیاكردۆتەوە.. لەكاتێكدا ئافرەت لەژێر ئەو هەموو ئازارو ئەشكەنجەو بێ بەهاییەدا دەژیا بەڵام تیشكی خۆری ئایینی پیرۆزی ئیسلام درەوشایەوەو مژدەی بەچارەسەر كردنی گشت گیروگرفتێكی كۆمەڵداو لەسەروو هەموویانەوە..

ئافرەت و مافی ئافرەت و شوێنی و پایەی تایبەتی لەناو كۆمەڵ و لەناو خێزاندا.. دوای هاتنی ئیسلام و دینە پیرۆزەكەی بۆ سەر جیهان خوا لەقورئاندا دەفەرموێت لەسورەتی (النساء).

(یاایها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة)

ئەوەمان بۆ روون دەكاتەوە كەئافرەتیش وەك پیاووە بەپێچەوانەی بیروباوەڕەكانی پێشووەوە..

بەچاوێكی یەكسانی دەڕوانێتە ئافرەت و پیاوەوە دەبێ رەفتاری پیاو لەگەڵ ئافرەتدا باش بێت.. هیچ مافێكی پیرۆزیان پێشێل نەكرێت بۆ نموونەی زیاتری بەچاوی یەكسانی بڕواننە پیاوو ئافرەت لەم سورەتەشدا دەفەرموێت.. قال تعالی.. یعمل من الصالحات من ذكر آو انثی وهو مؤمن فآولئك یدخلون الجنة ولایظلمون نقیرا/الایة ١٢٤.

بۆیە ئایینی ئیسلام دەڕوانێتە ئەم دیموكراتیەتەو بەچاوێكی یەكسانی بۆ ئافرەت بخەینەڕوو لەكاتێكدا



لەکۆمەڵگاکانی تر پێش ئیسلام هیچ نرخێکیان بەئافرەت نەداوە..

گەر پەرەکانی مێژوو هەڵبدەینەوە دوای ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەبینین چەندین ئافرەتی ژیرو سەرکردەمان بۆ دەردەکەوێت وەك (خانزادی میری سۆران و عادلە خێزانی وەسمان بەگی جاف و بەڵقیساو حەپسەخانی نقیب و میناخانی هاوسەری قازی محمدی ئەمرو قدم خێرو خەنساو ئەندێرا غاندی..

بەڵکو لەم سەدەیە شادو بینیت زیاتر لەئافرەتانماندا.. لەبواری کۆمەڵایەتیدا شان بەشانی براکانیان کار دەکەن و رۆژانە هەوڵ دەدەن زیاتر بۆ بەرەو پێشەوە بردن و بەدەست هێنانی مافی رەوای خۆیان.

**ئافرەت لەبری خوێن دان**

هەروەك دەزانین شتێکی شاراوە نیە.. کەئافرەت نیوەی کۆمەڵەو هیچی لەپیاوو کەمتر نییە.. بەڵکو کۆمەڵ بەبێ ئافرەت نەگونجاوە.. هەر ئافرەتە بویتە هۆی زیاد بوونی کۆمەڵ لەجیهاندا.. بەڵام چەند کێشەیەکی گەورە رووبەرووی ئافرەتی کوردبۆتەوە هەر لەکۆنەوە تا ئەمرۆش بەتاك و تەرادەی بینین یان دەی بیستین وەك جیاوازیەکی لادێ و دێهاتە دوورەکان و شارەکانی ترمان و جیاوازی و مامەڵە کردن لەگەڵ ئافرەتدا لەشوێنێك بۆ شوێنێکی تر. چارەنووسیان.. مافیان شێوازی مامەڵە کردن لەگەڵیان. هەر لەکۆنەوە ئافرەت کۆمەڵێکی سادەو ساکار بووە.. زەلیل و زوڵم لێکراوو بووە.. هەر ژێر دەستەیی پیاوو ئاغاو کوێخاو دەرەبەگ بووە.. ژێر دەستەیی نەخوێندەوار بووە.. مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەت کردووە لەکۆمەڵدا بەچاوێکی سووکایەتی و بێ بەش لەمافە رەواکانی خۆی.. باری سەرشانی قورس بووە.. ئافرەت ماندوو بووە.. ئەمیش دیاردەی نەخوێندەواری بووە کەرێگای لێ گرتوومو دوور بێت لەناو کۆمەڵدا.. بەڵکو رێی پێ نەدراوە.. گفتوگۆ بکات لەچارەنووسی خۆی.. نەیتوانیوە گیروگرفتەکانی بەردەم ژیانی خۆی چارەسەر بکات.. ئەم جۆرە دیاردەیە لەکۆنەوە رەگی داکوتابوو لەکوردەواریدا بەتایبەت لەدێهاتەکاندا.. کەژن بەژن و شیربایی ژن لەبری خوێن دان و مارە کردن لەسەر لانك و بێشکەکەی.

گەر ئەمانە کێشەی ئافرەت نەبن و گفتوگۆیان لەسەر نەکرێت دەبێ کێشەی دواییان یان چ چارەنووسێك چاوەڕوانیانی بکات... دەتوانین بڵێین لەدونیای ئەمڕۆدا خەریکی بنبڕکردنین لەکۆمەڵگاکاندا ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ خوێندەواری و نەهێشتنی نەخوێندەواری لەناو کۆمەڵدا.. دەبا بێینە سەرباسی کورتە باسێکی ژن لەبری خوێن دان وەك لێکۆڵینەوەیەك لەکۆندا..

ژن دان لەبری خوێن: پێناسەکردنی ئەم دیاردەیەیە ئەوەیە لەبەینی دوو عەشیرەتی جیاواز یان دوو خێزانی ناکۆك کوشتارێك روودەدات خێزان و کەسانی کوژراو داوای کچ دەکەن لەبکوژ ئەم دیاردەیەیە ئەوەیە لەبەینی دوو عەشیرەت جیاواز یان دوو خێزانی ناکۆك کوشتارێك روودەدات خێزان و کەسانی کوژراو داوای کچ دەکەن لەبکوژ ئەم دیاردەیەش لەدێهاتەکاندا زۆر روودەدات کەبکوژان دەبێت کچێك بدەن بەکەسی کوژراوو بۆ ئەوەی ناکۆکی و گیروگرفت نەمێنێ.. بەڵێ.. چارەنووسی ئافرەتێ جێی دەکرێت چۆن مامەڵە بەژیانی مرۆڤێك دەکرێت وەك (سلعەیەك) لەبری چی داوا لەچارەنووسی ئافرەتێك دەکرێت بەبێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر یاساو دادگا.. ئافرەتی بەسەرزمان دوور هەموو کارێکی مرۆیانەو چارەیی و ماف و ئاوات و خۆزگەکان.. چ کێشەیەکی بۆ دروست دەکرێ.. بەبێ هیچ رێ نمایەك و رێزێك بەچ چاوێك سەیر دەکرێت لەچارەنووسی داهاتوویدا.. دەبێ چ ژیانێك بەرێتە سەر لەگەڵ هاوسەرەکەی دەکەوێتە بەر چ قسەوباسێکی داهاتوو هەروەك ئاژەڵ مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن.. بەڵام ئەمڕۆ لەکوردستاندا رادەی خوێنەواری لەبنبڕ کردنی ئەم دیاردەو یانەدان.. ئومێداواریشین بەداهاتوویەکی نزیك ئەمەش نەمێنێ و بنبڕ بکرێت بەیەکجاری.





# چەند خاڵێک لەگرنگی پێدانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەئافرەتان

شیرین ئیبراهیم

١) لەقورئاندا سوورەتێک هەیە بناوی (النساء- ئافرەتان) بەڵام سوورەتمان نییە بەناوی (الرجال)، گومانی تێدا نییە کەهەر شتێ لەقورئان باس کرابێ لای خودی کەسیەتی ئیماندار پیرۆزو بەرێزو گرنگە.

٢) لەسوورەتی (مریم)دا ئەگەرچی سوورەتەکە باس لەهەندێک پێغەمبەران دەکات وەکو (ئیبراهیم، موسی، زکریا...) بەڵام ناونراو بە(مریم) ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئیجا بەخشێکە بۆ رێز لێنان و گرنگی پێ دان و پشت گوێ نەخستنی.

٣) چەندەها ئایەت لەقورئاندا باسی سەرتاپای مەسەلەکانی ئافرەت دەکات، لەساتێک ئەگەر شتێک یاخود رووداوێک یاخود پەندێک باس کرابێ لەقورئان لەیەک شوێندا، ئەوە نیشانەی گرینگییە، بەڵام دووبارە بوونەوە بەلق و پۆپ و چلی جودا ئەوا ئەوپەری گرینگی دانە مەسەلەی ئافرەتیش لەکلێشەی جودا جودا خۆی خزاندۆتە سورەتەکان وەکو (النساء، النور، الاحزاب، الطلاق).

٤) خوای گەورە بەرگری لەئافرەتێک دەکات کەپەنا دەگرێت بەخوا لەستەمی مێردەکەی. خوای بوونەوەر سوورەتێکی قورئان ئەنێرێتە خوارەوە تا چارەسەری خودی کێشەکەی بکات ئەویش لەسەرەتای سوورەتی المجادلە پرشنگەکەی رەنگ ئەداتەوە. خوای گەورە ئەفەرمێ: (قد سمع ا لله قول التی تجادلك في زوجها وتشتكي إلى ا لله وا لله يسمع تحاوركما إن ا لله سميع بصير) خوای گەورەو پایەدار سکاڵای ئافرەتێک لەبیر ناکات و دڵی ئاوەدان ئەکاتەوە بەناردنی قورئان و گەیشتن پێی لەرێگای پێغەمبەری نازدار (محمد) (ﷺ).

٥) قورئانی پیرۆز نەک هەر ئەوەندە بڕیاری مافی ئافرەت ئەدات بەڵکو زۆر لەوە زیاتر تێپەڕ دەکات وە هەڵساوە بەدانانی دەستورێکی هاوئاهەنگی تێکچڕژاوی پتەو قایم بۆ پەروەردە کردنی ئافرەت لەدەرەوەو لەناوەوەدا (لەجوهرو مظهردا) بۆ نموونە:

أ- ئافرەت فێر دەکات کەچۆن جل و بەرگ بپۆشێ (ولایبدین زینهن....

ب- ئافرەت فێر دەکات



کەچۆن جوولە بکات و بڕوات (ولایضربن بارجلهن....

جـ- ئافرەت فێر دەکات کەچۆن بئاخڤێ و گفتوگۆ بکات (..فلا تخضعن بالقول فیطمع الذي في قلبه مرض وقلن قولاً معروفاً).

لێرەدا فێریان دەکات کە طبقاتی دەنگیان چۆن بێ، چۆن چۆنی چینەکانی دەنگ بچرن بۆ ئەوەی زیان بە بەرامبەری خۆیان نەگەیەنن.

د- ئافرەت فێر دەکات کەچۆن ماڵەوە بکاتە فێرگەیەك و کۆلیژێك بۆ پێگەیاندن و پەروەردەکردن، چونکە بەڵگەنەویستە خێزان یەکەم پەیژەو یەکەم فێرگەیە بۆ چاو هەڵهێنانی منداڵ بۆ نێو دونیایەکی بێگەرد (واذکرن مایتلی في بیوتکن من ایت ا لله والحکمة إن لله کان لطیفاً خبیراً).

هـ- ئافرەت فێردەکات کەچۆن ماڵەکەی بەشەوق بکات و بیرازێنێتەوە بۆ بەختەوەری خێزان و چۆن لەگەڵ مێردەکەی رەفتار بکات، ئەمەش دەبێتە هۆی لەیەك گەیشتن.

و- لەسوننەتی پێغەمبەردا ئەگەر بڕوانین و سەیری ژیانی پێغەمبەر بکەین دەزانین لەهەموو کات و ساتەکانی ئافرەتی لەگەڵ دابووە، وە رۆڵی ئافرەت زۆر رۆشن و پرشنگدارو گەش بووە. بۆ نموونە:

١- لەسەرەتای ژیانی بازرگانی لەگەڵ (خدیجە) کردووە.

٢- کەلەئەشکەوتی (حـراء) سروشی (وحی) بۆ هات زۆر ترسا و وەیەکەم کەس ئەو سروشەی (وحی) بیست و خدیجە بوو کەباوەڕی بەپێغەمبەر هێنا، بەڵام پێغەمبەر زۆر ئەترسا کەچی خدیجە ئارامی دەکردەوە دڵی دەدایەوەو ئینجا بردیە لای وەرقەی کوڕی نەوفل.

٣) پێغەمبەرمان زۆر بەوەفا بوو بەرامبەر ئافرەتەکەی (خدیجە)و دەیووت (کەلاواز بووم پشتی گرتم و کەهەژاریش بووم یارمەتی دام) هەتا خدیجە لەژیان بوو پێغەمبەر هیچ ژنێکی تری نەهێنابوو.

٤) لەبیعەی عقبەی دووەم ٧٠ پیاو بەیعەتیاندا بەپێغەمبەر لەگەڵ دوو ئافرەتی لەگەڵ دابوو کەچی بیعەتی ئەو کاتە مەسەلەیەکی رامیاری بوو.

٥) لەهیجرەتی پێغەمبەردا (اسماء)ی کچی ئیمامی ابوبکر، رۆڵێکی گەورەی هەبوو، کەهەموو رۆژێ ئەچوو بۆ ئەشکەوتی (حەراء) هەواڵی ناو شارو خواردنی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ی دەبرد.

٦) لەجەنگەکاندا لەغەزا کردندا ئافرەتانی موسڵمان زامدارەکانیان هەتوان دەکردو برین پێچییان دەکردو ئاویشیان دەبرد.

٧) لەکۆتایی ژیانیدا پێش تەواو بوونی چرکەکانی ژیانی پێغەمبەر لەدواهەمین وتاردا لە(حجە الوداع) ئافرەتی لەیاد نەکردو ئومەت و حەشامەتی موسڵمانی ئاگادار کردەوەو فەرمووی (استوصوا بالنساء خیراً).

ئامۆژگاریم بۆ ئێوە ئەوەیە لەگەڵ خێزانەکانتان باش بن.









# خێزان بنەمای ژیان، یان ... شووکردن و ژن هێنان لەروانگەی ئیسلام دا

**عەبدول لەتیف باموکی**

هەر کاتێك باسێکی ئیسلامی بخرێتە بەر تۆژینەوە نووسەر تووشی سەرئێشە دەبێ، چونکە زاراوەکانی ئیسلام وەك خۆی ماوەتەوەو بەبێ ئاگاداریو فەرمایشی کۆڕی زانیاری کورد نابێ دەستکاری بکرێن نەوەك ببێتە پاشاگەردانیو بەرەڵڵاییو لام پەسەند نییە بەپاشگری (ئیزم) ووشەی نارەسەنی بیانی بەکار بهێنم، چونکە خودی ووشەکانو بەکارهێنانی ماوەی دەوێو دەبێ قەڵەم پێی رابێ، لەبەرئەوە زاناو مەلای کورد بەووشە فقهیەکان راهاتوون لەم باسەدا ووشەی نکاح، تەڵاق، عیددە، متعە، زینا، ژن، مێرد زۆر بەکاردێت تکایە کەس رەخنە نەگرێ چونکە ئەم زاراوانە بوونەتە کوردی خۆمانەو هەندێ رەوشتی ناپەسەند وەك زینا لەکوردی ناوی بۆ دانەنراوەو نامۆیە بەکوردو کوردی وە لەبەرئەوەی ووتارەکە جەمسەرێکی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر ئاڵۆز باس دەکات کاری ووشە ئارایی‌و رستەسازیو رەوانبێژی دەوری نییە، و کێشەکە چۆنە و چۆن هەستی پێ دەکەین و چۆن چارە دەکرێ دەبێ زۆر بەزەقی و راشکاوی و بێ پێچو پەنا پەردە بخرێتە ژێر تۆژینەوەو نوژدارە ئیسلامییەوە.

ماوەیەکە لێرە و لەوێ بەترسو لەرزو شەرمەوە باس لەقەیرە دەکرێ لەکوڕو کچو بەشوێن هۆکارو ئەنجام دەگەڕێنو هەندێ جار راوبۆچوونی توندڕەو دێتە ئاراوە، ئەوەش لەبەر ئەوە پەقەبارەی کێشەکە زۆر گەورەترە لەتواناو ووزەی ئێمەی کورد، ئەگەر غەیرە کورد کچەکەی نەدا بەشوو لەبەر سامان و ماڵەکەی و هۆکاری کۆیلەییو بەندەیی کچەکەی بێت، کورد لەشووکردنی کچەکەی قازانج دەکاتو کورد زۆر دەبێو ئەوە فراوان و بەشی نەخۆشیو هەژاریو نەخوێندەواریو لەناوبردنی دوژمنانیش دەکات و کوردستان بێ کورد نابێ وەك مەولەوی فەرموی عەشیرەت زۆر بێو بۆر بێ جارێ ئەوێ جارێ ئەوێ.

ئەوەی گومانی تێدا نییە خوا مرۆڤی کردووە بە خاوەنی ئەم زەوییە، و هەموو شتی بۆ دەستەمۆ و رام کردووە، و ژیری و فامی پێداوە بۆ ئەوەی لەرێگەی خواو پێغەمبەرو سروشەوە رێبازی خۆی بگرێت و ئەگەر نەبوو لەرێگەی تاقیکردنەوەو زانیاریو زانستەوە سوودو قازانج لەگشت کەرەسە خاوەکانی بەردەست وەربگرێو بۆ مانەوەی رەگەزی مرۆڤ هەرچی رێگەی چاك و حەڵاڵ بیگرێ و رێگە چەوتەکان حەرام کراوەو قەدەغەیەو سنوور و پەرژین و پاوان کراوە لەنێوان چاکەو خراپە حەرامو حەڵاڵ.

مەبەست لەسروشی خوداییو رەوانەکردنی پێغەمبەران (دروودی خوایان لەسەر بێ) ئەوەیە کە مرۆڤ زۆر جار بەژیریو فامی خۆی ناتوانێ رێگەی چاکە بدۆزێتەوە، ئینجا بۆ ئەوەی جڵەوی ژیریو فام





نەکەوێتە دەست سۆزو ئارەزووی بێ قەیدو شەرتو بێ مەرج و سنوورو رەها بەڵکو وەك خواردنو خواردنەوەو خەوو هەرمانەکانی دی بەپێی تواناو ووزەیە بەهەمان شێواز غەریزەکانی تری مرۆڤ بەپێی ویستی پەروەردگارو بەرژەوەندی سازی خودی مرۆڤەوە دەبێت، بۆ ئەم مەبەستە یاساو رێسای پتەوی پێکەوە ژیان دانراوە لەچوارچێوەی پارێزراوی (ژن هێنان و شووکردن) لەهەرەتی گەنجی و لاویدا کە لەسیو پێنج ساڵ زیاتر نەبێ و هەردوولایان بەتەمای جیابوونەوەو لێك ترازان و دوو دڵی نەبنو ژیانی هەمیشەیی و هێلانەی هێمنو ئارام پێکەوە دروست بکەنو هیچ لایەکیان بەخەیاڵو وەهمیان دانەیەت کە لەگەڵ مرۆڤێکی دی درێژە بە ژیان بدەن، (اليأس احدى الراحتين) یان قەناعەت یان خاکی گۆڕ خودای گەورەو خاوەن بەزەیی فەرمانی داوە بەلاوی کورو کچی گەنج بەحەلاڵیو هاوسەریو پرس و رای باوكو دایك و خزم ژیانی تازەی خۆیان دامەزرێنن و کۆشکی بەختەوەری دروست بکەنو خۆیان رزگار بکەن لەژیانی تەنهاییو یەك لایەنەو دووریو هەناسە ساردی بۆ ژیانی پڕ لە خۆشەویستیو جەنجاڵیو سەرقاڵیو گریانو زەردەخەنەی منداڵی ساوا کە قورئانی پیرۆز بەم ووشە ناسکە پڕ لەمانایانە ناوی ناوە (مودة، رحمة، محبة، لتسكنوا اليها)و ئاماژەی پێ کردووە، ئەوەی لەرێگەی ژیانی بۆ پەیدا نابێ لەبەر هۆکاری نەبوونیو دەست کورتیو هەژاریو کۆمەڵایەتی ترو ئاستەنگ دێتە سەر رێگەی فرمانی پێ دراوەکە خۆی بەپاکیو خاوێنیو خۆپاراستنو دەمو دڵو داوێن پاکی رابگرێ و خۆی دوور بگرێ لەکاری حەرام و قەدەغە، خوای گەورە دەرگای بەزەیی خۆی بۆ دەکاتەوەو پاداشتی بەنزیکی وەردەگرێ، وە هەست بەئارامی دەروونی دەکات زیاترو زیاتر

خوای گەورە دەفەرموێ (انكحوا الايامى منكم) وشەی (ايامى) مەبەست بێ مێردو بێ ژنەو ئەم ختابە بۆ هەموو گەلەو هەموو رۆڵەی میللەت چ نێر چ مێ دەگرێتەوە، چەندە کورێك بەرپرسیارە لەوەی هاوسەری ژیانیو هاوەڵی گونجاو هاولفی خۆی پەیدا بکات ئەوەندەش کچێك پێویستە هەوڵ بدات کە مێردی شایستەو هاوشان بدۆزێتەوەو خۆی بەگەورەو زل تەماشا نەکاتو بۆ بەرزو دەوڵەمەندو سامانو جوانی نەڕوانێو ژیانی بەختەوەرو کامەران لەخۆی تێك نەدات، بۆ خەیاڵ و وەهمو خەونی پووچو بێ مایە لەبەر ئەوە بەشوودانو مارەکردن دراوەتە دەست باوك نەك لەبەر باوك سالاریو بروبیانووی بێ جێو کەم متمانە بەکورو کچ، بەڵکو باوكو کەسوکار زیاتر قازانجی کوروکچ دەزانن و تاقیکردنەوەی تفتو تاڵیان دیوەو نایانەوێ هەڵەی خۆیان و خێزانیان لە کچو کورەکەیان دووبارە بێتەوە، هەندێ زانا فەرموویانە خیتاب بۆ سەرپەرشتیارو بەخێوکەری کورو کچە کە هاوسەر بۆ کورو کچەکەیان هەڵبژێرن و کاری بەیەك گەیشتنو پێکەوە ژیان ئاسان و سووك بکەنو هەرچی کۆسپو تەگەرەو ئاستەنگ هاتە رێگایان لای بدەن، چونکە تەنها دروست کردنی شانەی ژیانو ساواترین بنەمای خێزان لەکورو کچەوە دەست پێ دەکاتو ژیانی حەلاڵیو هاوسەری هەمیشەیی و بەردەوام دەبێتە هۆی پاكو خاوێنی دڵو دەروونو سۆزو داوێن.

پێغەمبەری رابەرمان (ﷺ) دەفەرموێو بەکردەوەش ئەنجامی داوە (اذا جاءكم من ترضونه دينه و خلقه فزوجوه، إلاّ تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد عريض).

ئەوە بۆ کورو بۆ کچ دەفەرموێ : (تنكح المرأة لحسبها ونسبها وجمالها فاظفر بذات الدين تربت يداك)، چونکە جوانی هۆی بەختەوەری ئافرەت نییە زۆر جار ژیریو فامو ماڵداری و چاك بەخێوکردنی منداڵ بناغەی پێگەیاندنی شێرە پیاو و کەڵەمێردە.

لێرەدا کێشەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر ئاڵۆزو پڕ لەئێش و ئازاری کوردو هەموو گەلانی جیهانی ئیسلام دێتە ناو باسەکەمانەوە کە ئەویش کێشەی مانەوەی کوڕ بێ ژنو مانەوەی کچ بێ مێرد بەواتەی



کوردی (قەیرە) پاش ئەوەی کاروانی تەمەنو زەمەن لەبەرچاو ناگرنو بەجێ دەمێنن لەهاوەڵو تەمەنو هاوسەرو هەناسەی ساردو بێ هیواو بێ وەجاخو ئەوەو خێزان دەچنە دنیای نەبوون سەر دەنێنەوە، ئەگەر لەدیدی قورئانو فەرموودەو رەوشتی پێشینەکانی خۆمان رەفتار بکەین کێشە هێندە ئاڵۆز نابێ و نابێتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی کە زۆر بەناشکراو حەقو زەق لەناو کچە دەولەمەندو فەرمانبەرو خوێندەوارەکاندا هەیە کە ئۆبالی لەئەستۆی خودی کچەکانە، ئەوەش خۆی داواکردنی زێرو پارەو ماڵو خانوو و ماشێن و پەلیو بیانووی نابەجێو زۆری مارەییو بەزەق تەماشاکردنو خۆ بەزل زانینو سەرکەشی بێ تام وگرێی تاوسیی لەدەروونی زۆربەی ئەوانەی ئەم باسەیان دەگرێتەوە، ئەگەر لەروانگەی شەرحعو رەوشتی پێشینەو ووردبینەوە دەبینین (رێبازی ظاهری) لایان وایە ژن هێنان و شووکردن ئەرکو واجبەو پشت گوێ خستنی تاوانە بەڵگەیان فرمانی خواو رەفتاری پێغەمبەر(ﷺ)و زانایانە، چونکە بە ژن هێنان و شووکردن کۆمەڵ خاوێن دەبێ لەداوێن پیسیو زینا شووی کە ئەوەش ئەرکی سەرەکی موسڵمانیە کە دوو ووشەیە (تخلیە) دووری لە گوناه و خوو رەوشتی خراپ و (تحلیە) وەرگرتنی رەوشتلا چاك و پاکو بەرز هەرچەندە ئەو زانایانەی دەفەموون نکاح حەلاڵ و مباحو سوننەتە بۆ کەسێك کە بزانێ تووشی گوناه دەبێ دەبێتە واجب زانای بەرز قورطوبی دەفەرموێ ئەم حوکمە دەگۆڕێ لەمرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێك، ئەگەر ترسی داوێن پیسیو نەخۆشی دەروونیو کۆمەڵایەتی هەبوو ئەو کاتە واجب دەبێ ئەگەر حەزی هەبوو، بەڵام هەژار بوو یان داواکاری نەبوو دەبێ لەرێگەی رۆژو گرتنەوە چارەسەری خۆی بکات هەتا خوای پەروەردگاریش دەروویی خێری لێ دەکاتەوە.

لێرەوە دەچینە ناو کێشەیەکی هەمیشەیی و گرفتێکی ئاڵۆز کە وەك نەخۆشیو درمی لێ هاتووەو ئەوانەی دەیانەوێ ئافرەت بووکەشووشە بێت و تەنهاو تەنها بۆ خۆشیو ئارەزووی خۆیو پیاو دروست کراوەو پەیامی هاوسەریو دایکایەتیو خێزانیو پەروەردەو فێرکردن پشت گوێ دەخەنو بەهەموو توانایانەوە دەیانەوێ ئافرەت بەبێ تاقیکردنەوەو بێ کەس بخەنە ناو دنیایەکی پڕ لەستەم و بێ سیستەم و گەلە گورگی دەمو لەموز خوێناوی و بەتاوان، ئەوەش لەژێر دێوجامەی ئازادی ئافرەت و سەربەستی بێ قەیدو شەرت، بەلێ شەرع دەفەرموێ باوك بۆی هەیە کچ بدات بە شوو، بەڵام بەزۆر نا بەپرس و راو رەزامەندی، زانای بەرێز (جەصاص) دەفەرموێ: باوك بۆی هەیە ژن بۆ کوڕ بهێنێ ەك بۆی هەیە کچ بدات بە شوو، چونکە دڵسۆزێکی شارەزایە، بەڵام پاش پرس و را پێکردنو را گۆڕینەوەو رەزامەندیو بێ دەنگی مانای رەزامەندییە بۆ کچ، لێرە ئەوە کێشەیەکی دی هەیە خراپ نییە ئەگەر کەمە تیشکێك بخەینە سەری، ئەویش ئەوەیە ئایا ژن دەتوانێ خۆی مارە بکات، ئێمە دووبارە دەگەرێینەوە سەر رێبازی شافعی رەحمەتی خوای لەسەرو ئیمامی ئەحمەد خوا پلەی بەرز بکاتەوە دەفەرموون: ناتوانێ سەربەخۆ خۆی بدات بەشوو ئەوەش لەبەر هەندێ دابو نەریتی کۆمەڵایەتیو کاتو زەمەن کاریگەری هەیە لە بۆچونەکەدا، بەڵام ئەگەر کێشەکە گەورەبوو بەخێوکەرو سەرپەرشتیاری خێزان بەهەڵە چارەڕۆژی کچ یان کوڕی نرخاند بۆیان هەیە پاش پرس کردن بەدادگاو دادوەرو خاوەن دەسەڵاتی وەخت خۆیان لەرێگەی کاربەدەستەوە واتە سوڵتان و حاکم شووکردن و ژن هێنان ئەنجام بدەن ئەوەك بەدزی و رەدووکەوتنو هەڵگرتن.

هەر لەروانگەوە حەز دەکەم ئاماژە بکەم بە مەسەلەیەکی زۆر ناسكو گرنگ ئەوەش ئەوەیە ئایا دروستە جیابوونەوە و تەڵاقدان بەهۆی نەبوونیو هەژاری مێرد بەپێی هیمای قورئان کە دەفەرموێ (ان یکونوا فقراء یغنیهم اللـه من فضلـه) نەخێر ژن





ناتوانن بەزۆر تەلاق وەربگرێ لەبەر نەداریو هەژاریوکەم دەستی مێردەکەی ئەگەر جیابنەوە هەژارترو کەم دەست تر دەبن، جگە لەوە زۆر بەناسکیو ووردی دیار دەکەوێ لە ئایەتەکەوە ئەگەر کوڕە هەژارێك داوای کچە دەوڵەمەندێك بکات و بیانووی هەژاریو کەم دەستیو نەبوونی نەکرێتە ڕێگر، خوای گەورە وەعدی داوە کە دەوڵەمەندیان بکات و گەلێك باشترە لەوەی کە کچەکە بێ مێرد پیر بێتو سامانی باوکی ببێتە ژەهری ماری کوشندە لەرێگەی بەختەوەری یان کوڕە هەژارێك پێویست نیە خۆی دوا بخات، چونکە کچە دەوڵەمەندە، بەڵکو لەرێگەی سامانی کچەکەوە دەوڵەمەند بێت کە بەتاقیکردنەوە دەرکەوتووە ئەو جۆرە خێزانە بەختەوەر نابێ لەفەرموودەیەکی راست دا هاتووە (ثلاثة حق على الله عونهم النكاح يريد العفاف...) کەواتە کوڕە هەژار با لەچینی خۆیو هاوشانی بناغەی خێزان دروست بکاتو خوای گەورە کەفیلە بەژیانیان.

لەم باسەوە دەبێ هێمایەکی خێرا بکەین بۆ جۆرە مارە بڕینێکی دوور لەرەوشتو دابو نەریتی ئیسلامو کوردەواری خۆمان و نامۆ بەهەموو بنەماکانی دادی کۆمەڵایەتیو یەکسانیو بەرز راگرتنی شوێن و جێگەی ئافرەت لەکۆمەڵ وەك دایكو خوشكو كچو هاوسەری ژیانو نەکرێتە کالایەکی بازاڕی بۆ کڕینو فرۆشتنو دامرکانی حەزو ئارەزووی هەوا پەرستو نەفس نزمەکانی ناو کۆمەڵو دوورە لەسروشتی مانەوەی نەوەی نوێ ئەوەش شێوازی (نكاح المتعة)یە بەواتەی ژن هێنان بۆ رابواردن وئارەزووی کاتی و بەماوەی کەم و کورتو دوور لەمەبەستی پێکەوە ژیانو بەختیاری هەمیشەیی خێزان و بەرهەمهێنانی منداڵو بەخێوکردنی نەوەی تازە.

لەراستیدا لەمێژە زانایان ئەوەیان سەلماندووە کە ئەم جۆرە ژن هێنانی دوورە لە ئیسلامو لەگەڵ رێبازی دادی ئیسلامو یەکسانی و مافی مرۆڤ ناگونجێ، بەڵام پاش ئەوەی تەوژمی بەرەڵاییو رەهایی بێ سنووری ژیانی کاتی ژن و مێردی پەرەی سەندوە دەیانەوێ بەم جۆرە زینا ئاشکرایە لاوو گەنج رابکێشنە تۆڕی جاڵجاڵۆکەی خۆیانەوەو خوو رەوشتو شارستانی نەخۆشی رۆژئاوا لە دەرگاوە بێتە ناو کۆمەڵگەی موسڵمانانەوە، چەندە بەرەڵایی ولێك ترازانی خێزان و زۆر بوونی منداڵی بێ خاەن و بێ‌ژوو کۆمەڵگەی رۆژئاوایان لەبەردەم گەورەترین مەترسی داناوەو جیهان بەرەو هەڵدێر دەباتو ئافرەت وەك ئامێرێکی بێ هەست و بێ گیانو بێ خواست دەچەوسێتەوە، بەو ئەندازەیە نکاحی ئارەزوی کاتی زیانی هەیەو کاردانەوەی خراپی هەیە.

زانایان فەرموویانە لەم ئایەتەوە (وليستعفف الذين لايجدون نكاحا) دەردەکەوێ کە نکاحی (متعه) نەك هەر دروست نییە بەڵکو پێچەوانەی داوێن پاکیو (عفة)یە، چونکە بەروونی خوای پەروەردگار داوای داوێن پاکی دەکات لەوانەی لەرێگەی شەرعیو یاساییو هەمیشەییەوە ناتوانن ژن بهێنن و سامانو داراییان نییە بۆ ژن هێنانی هەمیشەیی کە ناونراوە بەنکاح، کەواتە متعه نکاح نییە، بەڵکو خواستو ئارەزوویەکی کاتییە.

ئەگەر ژن هێنان کاتی بوو حەرامە لەژێر هەر ناوێك دابێت و هۆکارەکەش تەنها کاتەو هیچی تر وەك (مارە بەجاش، تحليل، صيفە، متعە، مسيار، مزيار، مسفار) کە لەهەندێ ولاتی بەناو موسڵمان و دەوڵەمەندو خاوەن سامان پەیدا بووەو باوە لەسەفەردا ژن دەهێننو ناوەکانی سەرەوەی بۆ دیاری دەکەن و هیچ جیاوازی نییە لەزاراوەی (مستأجرة للزنا) کە پەنا بەخوا لەهەندێ ولاتی ئیسلامی ئاساییەو شوێنی تایبەتی بۆ تەرخان کراوەو یاسا پارێزگاری دەکات، لەوانەیە بەخەیاڵ بڵێن خۆمان تەقلیدی (امامی) رافضي دەکەینو متعە چاکترە لەو تێکەڵییەی رۆژئاواو لەوەی ولاتە بەناو ئیسلامییەکان، شەریعەتی ئیسلامی ئەم جۆرە



نکاحەی حەرام کردووە، چونکە ئیسلام خێزان بەبناغەی کۆمەڵ دادەنێو هەموو حوکمە شەرعیەکان بەشێوەی هەمیشە و دائمی داڕێژراوەو کاتی پەسەند نی یە.

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەم ئایەتە پیرۆزە بەئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ کە خوای گەورە لەسەر مەسەلەی نکاحدا تەنها حەلاڵیو هاوسەری ژنو مێردی هەمیشەیی پەسەند کردوەو حەلاڵە و دوایی ئەوە قەدەغەیە.

﴿كتاب الله عليكم واحل لكم ما وراء ذالكم ان تبتغوا باموالكم محصنين غير كان مسامحين فما استمتعتم به منهن فاتوهن اجورهن فريضة ولاجناح عليكم فيما تراضيتم به من بعد الفريضة ان الله عليماً حكيماً-نساء/٢٤﴾.

دەچینەوە سەر باسەکەمانو هەندێ هۆکاری مانەوەی کچ بەبێ مێرد دیاری دەکەین و لەوانەیە هۆکاری کە هەبێت کە ئێمە باسمان نەکردووە. یەکەم دەگەڕێنینەوە بۆ بۆچوونی هەڵەی خودی ئافرەت کە بەهۆی خۆ بەزل زانینو زێڕو زیوو پارەو خشڵو ماڵو سامان ئامادە نیە شوو بکات، دووەم باوك کە نایەوێ کچەکەی مێرد بکاتو بەگومانی ئەوە زاواکەی هاوبەشی ماڵەکەی بێت، سێیەم هۆکاری خێڵایەتی کە هەندێ هۆز نایەوێ کچی خۆی بداتە بیانیو لەهۆزی خۆی کەس داوای ناکات، کچی هەژار دەبێتە قوربانی دابو نەریتی خێڵایەتی کۆنو رزیو چوارەم هۆکاری خوێندەواری و رۆشنبیری کچێك لەتەمەنی شەش سالی دەچێتە قوتابخانە شەشی سەرەتاییو شەشی ئامادەیی و شەشی زانکۆ، ئەوە بیستو چوار سال کە دەبێتە دکتۆر بەنیازە هاوشانی خۆی داوای بکاتو هاوشانی ئامادە نی یە لەگەڵ خوێندەوارترو زاناتر هاوسەر بێت لەبەر ئەوە خوشکی خوێندەوارو رۆشنبیر نایەوێ لەگەڵ جوتیارو کرمانجو لەخۆی کەمتر شوو بکات بێگومان دووبارە بەقەیرە دەمێنێتەوە، ئەوەش بۆ مامۆستا و فەرمانبەری کە دەچەمێتەوە، پێنجەم خۆپەرستی پیاوەکە هەمیشە حەز دەکەن تەمەنی خێزانیان بیست سال گچکەتر بێت بۆ ئەوەی کە جەنابی پیاو پیر بوو ئافرەتی داماو کارەکەرو کەنیزەکی بێ مزو ماف بێت و کچی هەژار کە تەمەنی گەیشتە ٣٥ سال کەس پێی رازی نابێو دەمێنێتەوە، شەشەم نەبوونی دەزگایەکی بەرپرس بۆ قەدەغەکردنی ژنی دووەم و سێیەمو چوارەم وەپیاو بەئارەزووی خۆی مافی هەڵبژاردنی هەیەو بارك الله خودی ئافرەت ئامادەیە زیانی بۆ هاوجنسی خۆی هەبێت دەبوو هەر پیاوێك کە هەنگاوە دەنێت بۆ ژنی زیادە خودی ئافرەت هاوکاری دەکاتو هەر کەس تەنها یەك ژنی هەبێ لەتەمەنی خۆی ئەو کاتە لەرێگەی کۆمەڵ، دادگا، ئافرەت، خاوەن کچ دەتوانن مەرجی پەسەند بۆ ژن هێنان و شووکردن بەپێی ضوابطی شەرعی دابنێن و کەس نەتوانێ سنوور ببەزێنێو لەتەمەنی شەست سالیدا کچی چواردە سال ئامادە نەبێ شووی پێ بکات ئەو کاتە مەجبورە دەبێ هاوتەمەنی خۆی بهێنێو بە تیرێك دوو نیشانە بپێکێت.

لەراستدا ئەم باسە ئەوەندە سانا نی یە بەووتارو دوو وتار چارەسەر بکرێت زۆرم پێ باشە کۆبوونەوەیەکی فراوان لەم بارەوە ساز بکرێت و زۆر لەو خوشکانەی کە رۆشنبیرو خاوەن بڕوانامەی کۆمەڵناسیو زانایانی دەروونی و شارەزایانی یاسایی لەم کێشەیە بکۆڵنەوە و رێگەچارەیەکی یاسایی بۆ بدۆزنەوە بۆ ئەوەی چیتر دیمەنی ئافرەتێکی پاکی بێ تاوانو سادە نەبێتە قوربانی دابو نەریتی سەپاوی پڕ لەستەم و بێدادی و هەر کەس مافی خۆی وەربگرێو دیمەنی ستەمی کۆمەڵایەتی لەهیچ خێزانێك نەمێنێو گەلێکی موسڵمان و نەتەوەیەکی بێ دەردو نەخۆشی لەکوردستان بژیو بحەوێتەوە بەهیوای ئەو زەمەنە موبارەکە. خوای پەروەردگار یاوەر بێت.



# لەبەرنامەی ئیسلامدا: پەروەردە کردن بەرپرسیارێتی کۆمەڵەو بەرپرسیارێتی، ئەرکێکی گەورەیە

نووسینی: عائیشە شێخ ساڵح شێخ بزەینی

بەرنامەی ئیسلام، سیستەمێکی تەواوی بەڕێوەبردنی ژیانی مرۆڤە، لەنێو هەموو برگەو چارەسەرو باسەکانیدا پرۆگرامێکی پەروەردەیی مرۆیی - ئەخلاقی هەیە، کەفەلسەفەیەکی دروستە بۆ نزیکبوونەوەی مرۆڤ لەبەها مرۆییەکانو ئەخلاقیەکانو لەو جیهانەی ئەمڕۆ کەفیکرو هەستی مرۆڤ بەرەو مادییەتو لەبارچوونو هەڵدێرانو نامۆبوون دەباتەوە ژیانی مرۆڤ لەئاژەڵان نزیک دەکاتەوە، تۆوی پەروەردەی ئەمڕۆ خۆپەرستیو دڵو دەروون بەستراوی لەدڵی منداڵاندا دەڕوێنێتو لەناکامدا تاکێکی خۆویستو زیانبەخشیان لێ دەردەچێت. بەدابو نەریتی مرۆییانە نامۆ دەردەچن، زۆری هەرە زۆری فەلسەفە پەروەردەییەکانی سەردەم لەخزمەتی ئەو جۆرە پەروەردەیەدان کەکۆمەڵگا وشک دەکاتەوەو هێز لەبەرهەستە مرۆییەکان دەبڕێت. بۆیە ئێستا زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا لەو سیستەمە پەروەردەییەیان بێزارنو هەوڵ بۆ سیستەمێکی دیکە دەدەن کەتێیدا مرۆڤ بەمانای (مرۆڤ) زیندوو بێتەوە. لەرۆژهەڵاتیشدا بەهەمان شێوە. هەر ساڵی پار بوو کەخانمی وەزیری پەروەردەی فەرەنسا رایگەیاند پێویستە وانەی (رەوشت) وەك وانەیەکی سەرەکی، لەقوتابخانە ئامادەییەکاندا بخوێنرێت ئینجا دوای ئەو کۆمەڵێك وڵاتی عەرەبی، چاویان لێکردو هەمان بڕیاریاندا.

لەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) چەندان ڕێوشوێنی دروست بۆ پەروەردەی مرۆڤ دانراوە. کەئێمەش گەلێکین لەپێناوی بەرزکردنەوەی پەیامی ئیسلامدا قوربانیمان داوەو، لەمێژووی شارستانییەتی ئیسلامدا جێگەمان دیارە، پێویستە سودی لێ وەربگرینو بۆی بگەڕێینەوە بەپێی ئاینی ئیسلام هەموو مرۆڤێك کەلە دایك دەبێت پاكو بێگەردو دروستەو هیچ تاوانێکی نییە، خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ فطرة ا لله التي فطر الناس عليها لاتبديل لخلق ا لله)، بەپێی ئەو بەرنامەیە مرۆڤ بەرە بەرەو لەدەوروبەری چاکەو خراپە وەردەگرێتو رێبازی ژیانی خۆی دادەڕێژێت (ونفس وماسواها فالهمها فجورها وتقواها)، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ لای خوای گەورە خەڵقندەیەکی پیرۆزەو لەتەواوی گیانلەبەرانی گەردوون جیاوازی هەیەو هەروەك چۆن خوای گەورە رێزی لێ ناوەو پێویستە رێزی لێ بگیرێت وەك لەئایەتێکدا دەفەرموێت: (ولقد كرمنا بني آدم وحملناهم في البر والبحر و رزقناهم من الطيات وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا)، بۆیە لەئاینی پیرۆزی ئیسلامدا پەروەردەکاران بەرپرسیاریەتێکی زۆر گەورەیان لەئەستۆدایەو وەك ئەو بەرپرسیارێتییە نییە کەرێوشوێنو فەلسەفە پەروەردەییەکانی دیکە دایانڕشتووە ئەوەی کەمێکیش لەفەلسەفەی ئیسلام تێ بگات دەزانێ کە(بەرپرسیارێتی) لەئاینی ئیسلامدا چەند گەورەیەو بەجێهێنانی چ پاداشتێکی هەیەو بەجێ نەهێنانی چ گوناهێکی گەورەیە. دەگێڕنەوە کەخەلیفە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) خوای لێ رازی بێت هەموو جاران رەنگی زەرد دەبوو و فرمێسك بەچاویدا دەهاتە خوارەوە کەگوێی لەو ئایەتە پیرۆزەی خوا دەبوو کەدەفەرموێت (وقفوهم انهم مسؤولون).

هەروەها کەپێغەمبەر دەیفەرموو (كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته).

بۆیە لەئاینی پیرۆزی ئیسلامدا مرۆڤ تاكو تەنیا نییەو بەتەنیا بەرپرسیارێتی رەوشتو رەفتاری خۆی هەڵناگرێت بەڵکو کۆمەڵگا، دایكو باوكو مامۆستاو خوشكو برای گەورە بەرپرسە لەپێگەیاندنو پەروەردە کردنیدا. زانستو پێشکەوتنی نوێ سەلماندوویانە کەتەنیا ئەو پێشکەوتنە بەرووتی مرۆڤ ناگەیەنێتە کەناری ئارامی. بەڵکو ئەگەر بەها مرۆییەکانی لەگەڵدا نەبێ بەپێچەوانەوە دەشکێتەوە وەك خوای مەزن لەو ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت (فمن يكفر باطاغوت ويؤمن با لله فقد استمسك بالعروة الوثقى).

بەڵام پەروەردە کردنی مرۆڤ بەبەهاو مانامرۆییە راستەقینەکان لەمنداڵیو لاویو پیریو پەککەوتەییدا مرۆڤ ئارامو ئاسودە دەکاتو هەرگیز هەست بەتەنیایيو ئازاری مادیو دەروونی ناکات.



# شارستانیەتی رەوشت

ئا: هەمزە سلێمان سمایل

مرۆڤ زۆر شارستانیەتی بەخۆیەوە دیوە کەژمارەیان لە(٢٠) شارستانیەت تێپەڕ دەکات، بەپێوەری توینبی. هەر شارستانیەتێك لەمانە، تام و چێژی تایبەتی خۆی هەبووە. کەلەوانی تری جیا کردۆتەوە. ئەم تایبەتمەندیە لەهەر شارستانیەتێك، بۆتە هۆی دامەزراندن و پێکهاتنی و دەرکەوتنی ئەو شارستانیەتە بەتایبەت کاتی گەشەکردن و نەشونماکردنی ئەم تایبەتمەندیە.

بێگومان کاتێك ئەو تایبەتمەندیە دووچاری بێ هێزی و لاوازی دەبێ، دەبێتە هۆی تێچوون و بزربوونی کەپێی ناسرابوو. ئەمانە هەر هەموو دیاردەیەکی روون ئاشکران.

یەك وانە کەدەیخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە. دەیخەینە ڕوو لەچەند دێڕێکدا. ئەویش تایبەتمەندی شارستانیەتی ئیسلامە لەسەر هەموو شارستانیەکانی تر.

کە کەشتی خۆی خستوتە گەر لەسەر تەوەری رەوشت لەکاتێکدا شارستانیەتەکانی تر بناغەیان لەسەرو سوۆز دامەزراندووە. یان لەسەر کشتوکاڵ یان بازرگانی و پیشەسازی. بەڵام هەرچی شارستانیەتی ئیسلامە لەسەرە بناغەی رەوشت دامەزراوە. کەمو زۆر ئەو شارستانیەتانە بایەخیان داوە بەهونەری هەمەچەشنە و جۆراوجۆر. ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەکاتێکدا بایەخی زیادی داوە بەزانست و زانیاری، بەڵام یەك تایبەتمەندی جیاوازی هەیە کەپێی ناسراوە ئەویش (رەوشتە) با بەیەکەوە سەرنج لەو چەند ئایەتە پیرۆزەی قورئان بدەین.

لەسورەی فەجر (ألم تر كيف فعل ربك بعاد إرم ذات العماد، ألتي لم يخلق مثلها في البلاد وثمود الذين جابوا السخر بالواد وفرعون ذي الأوتاد) الفجر ٦-٧-٨-٩-١٠، ئەوەی سەرنج راکێشەو ئیلهام بەخشەو کار دەکاتە سەر دڵ و دەروون کورت کردنەوەی باس و خواسی (٣) شارستانیەتە کە لەپێش ئیسلام هەبووینە، ئەو سێ شارستانیەتە، هەرسێکیان هونەر بەردی بناغەی دامەزراندنی و دروست بوونیان بووە. هەرچەند جیاوازی هەیە لەجۆری هونەرەکەیان.

**شارستانیەتی یەکەم:**

قەومی (عاد) لەباکووری نیمچە دوورگە عەرەبی دەژیان زۆر لێهاتوو شارەزا بوون لەهونەری دروست کردنی کۆشك و تەلار. شاری (ئیرەم) لەدەست کردی ئەوان بوو. مێژوونووسان باسی ئەم شارەیان کردووە: شارێك بوو بریتی بوو لەکۆشك و تەلاری چەندین قات. هەمووی لەسەر کۆڵەگەو ئەستوندە دروست کرابوو. کۆڵەکە لەسەر کۆڵەگەو قات لەسەر قات. لەدوورەوە وەك دارستانێك دەردەکەوت قەدی دارەکان هەر هەمووی بەردین بوون خوا لەقورئان فەرموویەتی (إرم ذات العماد، لم يخلق مثلها في البلاد).

**شارستانیەتی دووەم:**

گەلی (ثمود) بوو. ئەوانە میللەتێکی تر بوون لەنزیك گەلی (عاد) دەژیان. جێگەو شوێنیان دۆڵێکی بەردین و شاخاوی بوو. بژێوی گیانەوەر لەرووەك زۆر بەزەحمەت پەیدا دەبوو.

ئەوانە هونەری خۆیان خستە کار لەداتاشین. دەستیان کرد بەداتاشینی شاخ بۆ دروست کردنی خانووەکانیان. هەروەکو ئەشکەوت.

**شارستانیەتی سێیەم:**

دوای ئەوانە شارستانیەتی فیرعەون بوو لەمیسر ئەوەش لەنواندنی هونەری دامەزراندن و دروست کردنی پەرستگاکان زۆر کارامە بوون.

هونەری دروست کردنی شار لەلایەن گەلی (عاد)و هونەری دروست کردنی خانوو لەداتاشینی شاخ لەلایەن





گەلی (ثمود)و هونەری دروستك كردنی پەرستگاو بەشەكانی لەلایەن فیرعەون. هەرسێكیان لەسەر هونەر دامەزرابوون، هیچ كەمو كوڕیەكیان نەبوو، ئەگەر ستەمو زۆرداری وەلاوە بنێین.

مەبەستمان ئەو هونەرە پشت قایم نەبوو بەرەوشتو سۆزو متمانە لەمیان مرۆڤدا.

(الذينَ طغوا في البلاد فأكثروا فيها الفساد. فصبَّ عليهم ربُك سوط عذاب انَّ ربّكَ لبالمرصاد)الفجر١١-١٢-١٣، دوای ئەوانە شارستانیەتی مرۆڤو مرۆڤایەتی هات پێش هەموو شتێك (ڕەوشت)ی كردە بەردی بناغەی دامەزراندنی ئەم شارستانیەتەو پشتی بەست بەویژدانی، مرۆڤ. پێش ئەوەی بایەخ بدات بەدروست كردنی شار وەك شاری ئیرەم یا داتاشینی شاخ بۆ دروست كردنی خانووبەرەو دروست كردنی پەرستگای زلو زەبەللاح.

ویژدانی زیندوو بۆ مرۆڤ تاكە ڕێ نیشاندەرە بۆ هەڵسو كەوت لەگەڵ هاوڕەگەزی ئەوەش لەپێناو ئارامی دڵو دەروون.

لەكۆتایی ئەو سوورەتە خوا دەفەرمووێ:

(ياايتها النَّفسُ المطمئنة ارجعي الى ربك راضيةً مرضية فادخلي في عبادي وادخلي جنتي)الفجر ٢٧-٢٨-٢٩-٣٠. سەرباری ئەمانە هەمووی، شارستانیەتی ئیسلام بایەخی زیادی داوە بەزانستو زانیاریو لایەنی تریش. بەڵام ئەودی ئەو شارستانیەتەی پێ دەناسرێتەوەو پێی تایبەتمەندی:(ڕەوشتە).

**سەرچاوە: گۆڤاری (العربی) ژمارە (٢٦٠)ی ساڵی ١٩٨٠ كوەیت.**

# پەروەردەی ئایینیو چەند وتەیەكی پرشنگدار بۆ هۆشمەندی منداڵ

**هیوا عەباس**

پەیوەست بوون بەڕێبازی پیرۆزی ئایین، لەدیدی ئیسلامەوە، خوازیارە لەمرۆڤی بڕوادار، كارو ڕەفتارو ئاكارو بیروبۆچوونەكانی خۆی لەچوارچێوەی پیادەكردنی ڕێنمایی و یاسای ئەو ڕێبازە پیرۆزەی ئایین‌دا، بگونجێنێ و ئیلتیزام بەهەموو ئەم وتە جوانو پیرۆزانەوە بكات. كە لەپەروەردەكردنو گۆش كردنی ئاوەزی مرۆڤو هۆشیاری كۆمەڵایەتی خاوەن بڕواوە، دێتە ئاراوە، ئێمەی موسڵمان پێویستە لەسەرمان كەئەمری واقیعو ووتە پیرۆزو پرشنگدارەكانی. ئایینی ئیسلام لەبواری پەروەردەو ئامۆژگاری ئایینی، ڕەچاو بكەینو لەكارو كردەوەی ڕۆژانەماندا، ڕەنگی پێ بدەینەوەو لەدڵو دەروونمدا بەرجەستەی بكەین چونكە ئێمەی موسڵمان لەڕێگەی ئەو (پێغەمبەرە) نازدارەوە، ئەم ئایینە پیرۆزەمان بەدیاریو خەڵات لەلایەن خوای گەورەوە بۆ هاتۆتە خوارەوە، تا بە هۆیەوە لەتاریكیو شەوزەنگی جەهالەتو نەزانین دەربازبینو بكەوینە بەر ڕووناكی بڵێسەی ئیمانو خۆری ئیسلامو ئامۆژگاری ڕەوانی قورئانی پیرۆزەوە. هەر بۆیەش لێرەدا چەند وتەیەكی جوانو پرشنگداری ئایینی سەبارەت بەپەروەردەیەكی نوێی ئایینی بەنموونە دەهێنین:

* پەیدا كردنی خێزانی بەختەوەر، لانكی پەروەردەی زانستو دروست. بۆ گۆش كردنی وەچەو منداڵ دروست دەكاتو بەهیواوە ڕای دەژەنێ.

* منداڵ بەو نرخو بایەخەوە، كەخوا خوڵقاندوویەتی، ئەركی سەرشانی دایكو باوكە، كەپشت گوێی نەخەن.

* مافی منداڵو پەروەردە كردن. هەڵبژاردنی ناوی پیرۆزو فێركردنی قورئانو پێ خوێندنیەتی.

* منداڵەكانتان فێری زانست بكەن، چونكە قۆناغو ژیاری ئەوان جیاوازە لەهی ئێوە.

* حەوت ساڵ یاری بكە لەگەڵ منداڵو حەوت ساڵ تەمێی بكەو حەوت ساڵیش هاوڕێیەتی بكە پاشان بیدەرە دەست خۆی، با كاری خۆی ئەنجام بدات.

* منداڵتان خۆش بوێتو بەزەییتان لەدڵدا بێت بەرامبەریان. سەركوێریان مەكەن ، كاتێك، بەڵێنیشیان پێ دەدەن، بۆیان جێبەجێی بكەن.

* لەڕۆژی ئاخیرەتدا، منداڵ دەبێتە واسیتەو شەفاعەتكاری باوكو دایك بۆیە تا دەتوانن بەجوانترین شێواز، پەروەردەیان بكەن.

* ئامۆژگاریو پەروەردەكردن، لەخاڵی ئینتیلاقی ئەخلاقو ڕەوشتی پەسندەوە. سەرچاوە دەگرێتو نیشان دەپێكێ.

**سەرچاوە: گۆڤاری دەنگی زانا**



# پەیڕەوی ئیسلام لەپەروەردەدا

ئامادەکردنی بەدەستکارییەوە: ساجیدە ئیسماعیل قادر

**(المؤمن القوي خير واحب الى ا لله من المؤمن الضعيف)**

(حديث صحيح رواه مسلم)

بەهێز لەبڕوادایە، بەهێز لەویستو لەشو توانای ئارەزووەکانی. وشەی بەهێز، هەموو لایەنێکی هێزی لەش دەگرێتەوە بەمەرجێك ئەم هێزە بۆ چاکە ئاراستە بکرێت نەك بۆ کاری خراپە.

لەبەرئەمە، ئاینی پیرۆزی ئیسلام بناغەو پەیڕەوێکی بۆ بنیادکردنی موسڵمانی بەهێز دارشتووەو پشتگیریو چاودێری دەکات لەسەرجەم قۆناغەکانی تەمەنیدا، هەتا بەر لەدایك بوونی ئەو مرۆڤە، کەخۆشەویستیو سۆزو بەزەیی دەخاتە نێوان ژنو مێردەوە، کاتێك ئەو مرۆڤە منداڵەو لەزگی دایکیدایە، تەنانەت لەقۆناغی شیر پێدانو ناو لێ نانیش.

پەیڕەوی ئیسلامیش لەپەروەردەکردندا، لەیاساکانی خوای مەزنو سەرجەم زانستەکانو یەقین دەگرێتەوە، خوای گەورە دەفەرمووێ (ألا يعلم من خلق وهو اللطيف الخبير)(الملك) ئەو یاسایانەش لەسەر بناغەی تیۆرو بۆچوونی مرۆڤ دانەنراوە تا گۆڕان یاخود یاسای دیکەی بەدوادا بێت، بەڵکو خوا یمەزن بەچەسپاوی خستویەتیەڕوو، (إن يتبعون إلا الظن وإن الظن لايغني من الحق شيئا)النجم/٢٨.

پەروەردە رەوشت لەئیسلامدا چەندین لایەن بەخۆوە دەگرێت کەبۆ بیناکردنی کەسایەتی مرۆڤو کۆمەڵ زۆر گرنگن، لەوانە خۆشەویستی کارکردنو سستمو یاساو رێزگرتنو گوێ رایەڵیو پەیوەندییە رەسەنەکان.

هەندێ بەهاونەریتی دیکەش هەن کەپەیوەندی بەکرداری پەروەردەوە هەیە لەوانە:

١- فێرکردنی بچووكو پەروەردەکردنیان بەو ناوەی کەپەروەردەو فێرکردن مەبەستە نەك هۆ کەفەرمودەکەی خوای مەزنی تێدا بەرجەستە دەبێ (قل هل يستوي الذين يعلمون والذين لايعلمون)(الزمر:٩) و (يرفع ا لله الذين آمنوا منكم والذين أوتوا العلم درجات)(المجادلة١١).

٢- قوتابیانو مامۆستایان دەبێت پەیوەندییان وەك باوكو کوڕ بێتو بێجگە لەفێربوونو بەخشینی زانست پێویستە بەزەییو هاوکاریو یارمەتی دەری یەکتربنو هەمیشە لەیەکتر ببوورنو رێزی یەکتر بگرن، خودای مەزن دەفەرمووێ



(والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس وا لله يحب المحسنين)(آل عمران: ١٣٤).

٣- پێویستە مامۆستایان هیچ زانستێك لەقوتابیەکانیان نەشارنەوەو هەرچی دەیزانن لەرێگای فێربوونو پەروەردەدا پێیان ببەخشن هەروەها بەم شێوەیە کۆمەڵگای ئاسوودە دەبێتو گشت بەها رەسەنەکان دەپارێزرێن، بزانن لێرەدا خوای گەورە چۆن باسی ئەهلی کتاب دەکات لەجولەکەکان کەئەوەی خوا فێری کردبوون لەخەڵکەکەیان دەشاردەوە بۆیە دەفەرمووێت:(ان الذين يكتمون ما انزلنا من البينات والهدى من بعدما بيناه للناس في الكتاب أولئك يلعنهم ا لله ويلعنهم اللاعنون) (البقرة:١٥٩).

بەم شێوەیە پەیوەندییەکی بەهێزو رەسەن لەنێوان مامۆستاو قوتابی دروست دەبێت کەبناغەو پەیرەوەکەی لەئیسلامەوە هەڵدەهێنجێ. کەلەمیانی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ کراوە. لێرەدا جارێکی دیکە پێویستە لەسەر زانایانو مامۆستایان کەتا پێیان بکرێت ئەو زانستەی خودا پێی بەخشیون، بیدەن بەقوتابیەکانیانو زانست هەرگیز بەزێڕو زیو ناپێورێتو هەتا دونیاش مابێت ئەو زانستە هەمیشە دەبێتە هۆکارێك بۆ رێکخستنی کاروباری کۆمەڵو ئاسوودەگیو بەرەو پێش بردنی کاروانی پێشکەوتنو داهێنان.

خێزان لەدیدی ئاینی ئیسلامەوە پلەو پایەکی بەرزی هەیەو بەگرنگترین پێکهاتە دادەنرێت بۆ گەورەکردنی مرۆڤو ئاراستە کردنی بەرەو پاشەڕۆژی روونـاكو پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی.. لەنێو خێزاندا مرۆڤ گەورە دەبێتو فێری بەزەییو بەیەکەوە ژیانو بەها رەسەنەکان دەبێتو لێرەشدا رۆڵی خێزان راستو پابەند بەئاینی پیرۆزی ئیسلام دەردەکەوێت کەرۆڵەکانی لەسەر بنچینەی پەروەردەکردنی راستەقینە رادێنێو هەمیشە بۆ پاراستنیان لەخراپەو کاری نابەجێ تێدەکۆشێ (ومن آياته ان خلق لكم من انفسكم أزواجاً لتسكنوا اليها وجعل بينكم مودة ورحمة إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون)(الروم:٢١).

دیارە ئەرکی خێزان تەنیا پەروەردەکردنی منداڵ نییە، بەڵکو دوای ئەوەی منداڵ روو لەقوتابخانە دەکات پەیوەندی نێوان خێزانو قوتابخانە زیاتر دەبێت، بەڵام منداڵ لەماڵەوە سەرجەم دابو نەریتە رەسەنەکانی کۆمەڵگای ئیسلامەتی فێر دەبێت وەك نوێژو رێزگرتنی گەورەو بەزەیی هاتنەوە، کەدەگاتە قۆناغی زانکۆش لەو هەلو مەرجە ناسکەدا پێویستە لەم دابو نەریتە گرانبەهایانە لانەداتو بەردەوام پەیڕەویان بکات.. نابێت راگەیاندنو رۆشنبیری رۆژئاوا کەهاندەری خراپەکاریو گەندەڵیە کاریان تێ بکات، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت (وان هذا صراطي مستقيما فأتبعوه ولاتتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله ذلكم وصاكم به لعلكم تتقون)(الانعام:١٥٣).

سەرچاوە:
گۆڤاری
(المجتمع العدد ١٣٠٨)
١٩٩٨/٣/١٤.





# خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزو دەنگێکی بەسۆز...!

**دیمانە: موحسین چینی**



لەبۆنەو یادی لەدایکبوونی پێغەمەری مەزندا دەنگێکی بەسۆزو رەسەنی پڕ لەواتای خودا بەرستی ناخی دەروونی گوێگری موسولمانی کورد دەبزوێنیو لەچێژی تەمەنی کورتی مرۆڤ پەشیمانی دەکاتەوەو مرۆڤی موسولمانی خاوەن دەروون پاك لەپلەکانی خودا پەرستیو دنیای هەمیشەیی نزیکی دەکاتەوە، هەڵبەتە خاوەنی ئەو دەنگە پڕ لەغوربەتەش ماوەیەکی زۆرە لەم بوارەدا لەئەزموونەو خاوەن چەندین بڕوانامەی بەپلە مومتازی دەرەوەی کوردستانە. ئەوەی لەخوێندنی قورئانی پیرۆزدا بڕوانامەی پلە مومتاز وەربگرێت هەڵبەتە لەرووی (تجوید)ەوەش دەبێت زانا بێت..

ئەو خوێنەرەش مامۆستا مەلا مەردان جەبار. کوڕی حاجی جەبارە قەسابە. دەرچووی خانەی مامۆستایانی هەولێری ساڵی ١٩٦٤ـەلەدوای (٢٧) ساڵی مامۆستایەتی راژەی خۆی گواستووەتەوە وەزارەتی ئەوقافو ئێستە لەمزگەوتی حاجی رەشاد نەجار خوێنەری قورئانی پیرۆزە. لەدوو خولی خوێندنی قورئانی پیرۆز بەشداری کردووە ساڵی ١٩٧٩ لەبەغداو ئەوی دیکە ساڵی ١٩٩٠ لەشاری موسل.

**خۆری ئیسلام**: چۆن سەیری ئەزموونی ئێمەمان دەکەیت کەپەرلەمانو حکومەتمان هەیە؟

- گومان لەوەدا نییە عەرەبەکان لەپێش ئیسلامبوونیاندا لە نیمچە دوورگەی عەرەبی لەقۆناغی خێلەتیدا بوون، کەچی پێغەمبەری مەزنمان هەر کە گەیشتە یەثرب دەستوورێکی دانا لەراستیدا دەستوورەکە بنەمای دامەزراندنی دەولەتی ئیسلامی بوو. ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئایینی ئیسلام خۆی لەخۆیدا ئایینێکی کامیلەو لەهیچ بوارێکی ژیاریدا کەمو کوری نییە، ئێمەی کوردیش ئەگەر هەمووما باوەڕمان بەتەواوی بەئایینی پیرۆزمان هەبێت بێ گومان گەلی کوردیش لەماوەیەکی کەم وەك دەولەتانی دیکە ئالای سەربەخۆیی بەرز دەکاتەوە.

**خۆری ئیسلام**: تەجوید لەرووی زمانو زاراوە چییە؟

- لەرووی زمانەوە مانای ئەوەیە قورئانی پیرۆز بەچاکیو





بەزمانی پاراو ڕەوان بخوێندرێتەوە.

لەڕووی زاراوەش.. زانستێکە باس لەوە دەکات کە لەکاتی خوێندنەوەدا هەر پیتێك مافی تەواوی خۆی بدرێتێ.. لەسیفەتەکانی درێژکردنەوەو ئەوانی دیکەی وەك سەرو ژێرو گەورە کردنەوەی پیت و ڕێزمانەکانی.

**خۆری ئیسلام:** مەبەست لەزانستی تەجوید چییە؟

مەبەست لەزانستی تەجوید لەوەدایە کە قورئانی پیرۆز بەهەڵە نەخوێندرێتەوەو زمانیش لەراستی خوێندنەوەی رابهێندرێت.

**خۆری ئیسلام:** ئەگەر خوێنەرێك بە (أعوذ بالله)و (بسم ا لله) ئایەتێکی پیرۆزی خوێندەوە بەچەند شێوە دەتوانێت بیخوێنێتەوە؟

- بەچوار شێوە.. هەموویان بەجیاجیا (أعوذ با ا لله)و (بسم ا لله) بەیەکەوە ببەستێتەوە. (بسم ا لله) بەسوورەتەکە ببەستێتەوە.

چوارەمیش ئەوەیە خوێنەر دەتوانێت هەموویان بەیەکەوە ببەستێتەوە.

**خۆری ئیسلام:** ئەگەر دوو سوورەت (بسم ا لله)ی کەوتە نێوان بەچەند شێوە دەخوێندرێتەوە؟

- بەچوار شێوە.. سێیان دەکرێت یەکیان نابێت، لەسێیەکە دەکرێت هەموو بەجیاجیا بخوێندرێتەوە. دووەم دەکرێت (بسم ا لله) لەگەڵ سوورەتی خۆی بخوێندرێتەوە. سێیەم دەکرێت هەموو بەیەکەوە ببەسترێتەوە ئەوەی نابێت ئەوەیە کە سوورەت تەواو دەبێت نابێت (بسم ا لله) بەدواوە ببەستێتەوە، چونکە ئەوەی دەیبیستێ وادەزانێ (بسم ا لله) یەکە لەگەڵ سوورەتی پێشترە.

**خۆری ئیسلام:** یاساکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز چەندە؟

- یاساکان حەوتن:

یاساکانی (اعوذ با لله)و (بسم ا لله)- یاساکانی نونی بێ دەنگو کراوە- یاساکانی (میم)ی بێ دەنگو میمی توند کراوە- یاساکانی (لام)ی شەمسیو قەمەری- یاساکانی بەیەکەوە بەستنەوەی پیتەکان- یاساکانی درێژکردنەوەی پیتەکانو بەشەکانی - یاساکنی راء.

**خۆری ئیسلام**- لەخوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا لەسەر هەندێك وشەی وەك (المفلحون) بەتەواوی دەوەستین.. ئەمە چۆن لێکدەدەیتەوە؟

- ڕاوەستانی تەواو ئەو حاڵەتەیە کەوشەکە پێوەندی نە بەرستەی پێشەوە، نە بەرستەی دواتریشیەوە هەبێت ئەمەش مەبەست لەوەیە کەوشەکە نەبەماناو نەبەدەربڕینیش پێوەندی بەوشەکانی دیکەوە نەبێت.

**خۆری ئیسلام:** پیتە شاراوەکان (الاخفاء) چەندە؟

- پیتە شاراوەکان لەقورئانی پیرۆزدا (١٥) پیتە. هەرپیتێکی یەکەمی وشەکانی ئەو بەیتە. پیتە شاراوەکانی قورئانی پیرۆز پێکدەهێنن.

صف ذا ثنا قد جاد شخص قد سما

دم طيبا زد في تقى ضع ظالما.

**خۆری ئیسلام:** ئەی پیتە دیارکراوەکان چەندە؟

- ئەویش (٦) پیتەو پیتەکانی پێشەوەی ئەم رستەیە:

أخی هاك علما حازە غیر خاسر.

**خۆری ئیسلام:** جگە لەپرسەو





بۆنـەكان چـی دیكـە قورئـان دەخوێنیتەوە؟

- هـەموو بـەیانیانی هـەینی جـارێك سـوورەتی (الكهـف) دەخوێنمەوە كە لە (١١٠) ئایـەت پێكهـاتووە.. ئەمـەش نزیكـەی (٢٧) ساڵە لەم خوێندنەوەیە بێ پسـانەوە بـەردەوامم. خوێندنەكەش پێشكەش بەگیانی هـەموو موسـولمانە مردووەكـان دەكـەم. سـێ مـانگی رەمـەزان بەردەوامی قورئان دەخوێنم.

**خۆری ئیسلام:** موچـەتان چۆنە.

مەلایـەكانی وتـار خوێنـی هـەینییان مووچـەیان باشـەو لەوانەیە بەشی گوزەرانیان بكات بـەڵام قورئـان خوێنـە رو بـانگدەر موچـەیان لـەنێوان ١١٠و ٢٥٠ دینارە. ئێستەش گرانییـەو ئەمـە بەشی گوزەرانی ناكات.

**خۆری ئیسلام:** سـەركردەی شۆڕشـەكانی گـەلی كورد بەگشـتی پیـاوی ئـایینیو خـاوەن تەكیـە بوونـە وەك شـێخ مـەحموودی حـەفیدو شێخ سـەعیدی پـیرانو قـازی موحەمـەدی شـەهیدو مـەلا مستەفا نەمر. چۆن سەیری ئـەم راپەرینانـە دەكـەیت كـە لـەدژی دەوڵـەتانی ئـێرانو توركیـاو عـێراقدا بـووە كـەچی ئـەم دەوڵەتانـەش خۆیـان بەدەوڵـەتی ئیسلامی لەقەڵەم داوە؟

- هەر میللـەتێكو نەتەوەیـەك گـەر هـاتو نیـازو ئامـانجی خـۆ پەرستی بێتو خۆشی هەرگیز بۆ خـۆی بویـت زۆربـاش بزانێـت سـەركەوتن لەمانـە زۆر زۆر دوورە وە ئاگاتە هیچ ئامانجێك هـەروەها بەفـەرمانی ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەری مـەزن موحەمـەد (ﷺ) (لایومن احدكم حتی یحب لأخیة مایحب لنفسة) راوه الشیخان.

**خۆری ئیسلام:** ئـەی (حـب الوطن من الایمان)!

- سـەیری فـەرموودەی خواوەنـدی گـەورە بكـە كەدەفەرموێت: الذین اخرجو من دیارهم بغیر حق..... ئەمە رێگـە بەهـەموو موسـلمانێك دەدات كەبەرگری لەماڵو سامانو خاكی خۆی بكات.

ئەمـەش مانای ئەوەیە كەئـەو موسولمانە بـەرگری لەخێزانیكی موسـولمانو لـەخاكێكی ئیسـلام دەكات ئەمەش لەئاینی ئیسلامدا (جـائزە) كەهـەر موسـولمانێك بـەرگری لـەماڵو سـامانو خاكەكەی خۆی بكات.

دوا پرسـیار **خۆری ئیسـلام**: هەندێك خوێندنی قورئانی وەك شـێوەی مـەقاماتی عـێراقی دەبیسـتم بەتایبـەتی خوێندنـەكانی تـۆ. لەمـەدا چـی دەڵێیت؟.

- مـن لـەو بـاوەڕم ئـەو مەقاماتانـە پێش ئـەوەی بـەو شـێوەیەی ئێسـتە كەهاتووەتـە نێوەنـدی هونەرییـەوە،ئەمانـە بەگشـتی لـەخوێندنی قورئـانی پیرۆز وەرگیراون، قورئـانی پیرۆز بە هەموو شێوە نزمەكانی رەست، دەشـت،بـەیات،حیجـاز چوارگـا دەخوێندرێت، خوێندنی قورئانی پیرۆز دوور نییـە لەخوێندنـەوەی بـەنزم.. بـەڵام مەقاماتـەكانی عێراقی كەپتر لە ١٠٠ ساڵە هەیە بەگشـتی لەسـەر نزمـی خوێندنـەوەی قورئـانی پیرۆزدا دارێـژراوە. بـەخۆم ئـەو خوێندنانەم بەگشتی خوێندووەو ئەوانـەی گـوێ بیسـتم بوونـە بەگشـتی سـەرنجی ئـەو خوێندنانەی منیان داوە..





# گوڵ گەشتێک بەچاپکراوەکانی ئایینیدا




📖 زانین رێگا تێگەیشتنا قورئانییە، کتێبێکە تایبەت بە ووتارە ئایینییەکانی بەڕێز (مەلا حوسێن یوسف عەبدولقادر مارۆسنی) کە لەلایەن بەڕێز مامۆستا جهاد ئیسماعیل عەبدولسەلام بارزانی ئامادە کراوەو لەساڵی (١٩٩٨)ی زایینی بەرامبەر ساڵی ١٤١٩ی کۆچی لەشاری هەولێر چاپکراوە، کە پێکهاتووە لە وتارە تەفسیرییەکانی هەردوو سورەتی (فاتیحەو بەقەرە)..

پیرۆزبایی و دەستخۆشی بۆ مامۆستا دەخوازین لەپێناوی خزمەتکردن بەرێبازی ئایینی ئیسلامی پیرۆز.

📖 تەفسیری رەوان بۆ تێگەیشتنی قورئان، چاپکراوێکی تازەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە کە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆزی بەشێوەیەکی پاراو، تەفسیر کردووە، کەجزئی یەکەم و دووەمی لەبەرگی یەکەمداو جزئی سێیەم و چوارەمی لەبەرگی دووەمدا، بەقەوارەی (٢١٨و ٢٣٨) لاپەرە لەنووسینی مامۆستا مەلا مەحمودی گەڵاڵەییەوە لەچاپخانەی وەزارەتی پەروەردە لەساڵی (١٩٩٨) چاپکراوە.




📖 بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، لەرێگەی دەستخەتەکانیانەوە. کتێبێکی مێژوویییەو لەلایەن (مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی) دانراوەو بەرگی یەکەمی لە (٣٩٢) لاپەرەو لەساڵی (١٩٩٨)دا کەوتۆتە بەردەستی خوێنەرانی موسڵمان کە چەند بەڵگەنامەیەکی مێژوویی گرتۆتە خۆی



📖 کۆمەڵایەتی لەکوردستاندا، نامیلکەیەکی کۆمەڵایەتی گشتییەو، لەلایەن مامۆستا محەمەدی مەلا قادر بەرپرسی مەکتەبی کۆمەڵایەتی گشتی، ئامادەی چاپ کراوەو بەهاوکاری وەزارەتی رۆشنبیری هەرێم، لە ساڵی (١٩٩٨) لەهەولێر چاپکراوە.




📖 کتێبی (کتاب سراج السالکین)، دانراوی شێخ حوسێنی قازییەو لەلایەن محەمەد جەمیل رۆژبەیانی وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەرەبیو یەکێکە لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستانو لەساڵی (١٩٩٨) چاپکراوەو تایبەتە بەبواری رێگای حەقیقەت و سۆفیگەری.

